# الشَّرحُ والإبانةُ

عَلى

# أُصُولِ السُّنَّةِ والدِّيانَةِ

وَمُجانَبَةِ المُخالِفِينَ

وَمُبايَنَةِ أَهْلِ الأَهْواءِ المارِقِينَ

وَهُوَ المَعْرُوفُ بِـ "الإِبانَةِ الصُّغْرى"

بە کوردی


نووسینی:

أَبي عَبدِ اللهِ عُبَيدِ اللهِ بنِ مُحَمَّد ابنِ بَطَّةَ العُكبَرِي

وەرگێڕانی:

مجد الحنبلي

# الشَّرحُ والإبانةُ

عَلَى

# أُصُولِ السُّنَّةِ والدِّيانةِ

ومُجانبةِ المُخالِفينَ

ومُبايَنةِ أهلِ الأهواءِ المارِقِينَ

وهُوَ المَعرُوفُ بِـ "الإبانةِ الصُّغرى"

بە کوردی


نووسینی:

أَبِي عَبدِ اللهِ عُبَيدِ اللهِ بنِ مُحَمَّدِ ابنِ بَطَّةَ العُكبَرِيِّ

وەرگێڕانی:

مجد الحنبلي

# پێشەکی

ئەمە کتێبی (الشَّرحِ وَ الإِبانَة عَلى أُصولُ السُّنَّةِ وَ الدِّيانَة) ی **إِبْنُ بَطَّة** العکبري ە، کە کتێبەکە ناسراوە بە (الإِبانَة الصُّغرىٰ)، وە ئەمە کتێبێکە کە نوسیویەتی بۆ ڕوون کردنەوەی بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعە، هەروەها بۆ ئاگاداری دان لە بیدعە و گومڕایی ئەهلی بیدەع .

کتێبەکە پێکدێ لە **٤** بەش و **٥٥٣** ئەثەر، وە **إِبْنُ بَطَّة** لەم کتێبەدا سەنەدی ئەثەرەکانی لابردووە تاوەکو کتێبەکە کورت و پوخت بێ .

بەشی یەکەمی باس لە پابەندبوون دەکات بە ئاثاری سەلەف وە زەمی بیدعە و ئەهلەکەی دەکات، وە لە بەشی دووەمدا ئەو بیروباوەڕە باس دەکات کە کۆدەنگی سەلەفی لەسەرە، پاشان لە بەشی سێیەمدا لە بارەی ئاداب و عیبادەتەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ دەدوێ، وە لە بەشی چوارەمیشدا کۆتایی پێ دەهێنێ بە ئاگاداری دان لە بیدعەکان وە کۆمەڵێك لە موبتەدیعەکانیش دەناسێنێ .

# پوختەیەك لە ژیانامەی ئەم ئیمامە بەڕێزە

**ناو** : عبيدالله بن محمد بن محمد بن حمدان بن عمر بن عيسى بن إبراهيم بن سعد بن عتبة بن فرقد ی هاوەڵی رسول الله ﷺ .

**کونیەکەی** : باوکی عبدالله العكبري - کە دەگەڕێتەوە بۆ عکبرا، کە ناوچەیەکە لەسەر دیجلە دەکەوێتە سەرووی بەغداد بە پێنج سەد فەرسەخ - .

**نازناو** : **إِبْنُ بَطَّة** ، کە دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لە باپیرانی .

**لە دایك بوونی** : ٣٠٤ هـ

**وەفاتی** : ٣٨٧ هـ

**ژیانی** :

**إِبْنُ بَطَّة** لە ماڵێکی زانست و سوننەتدا گەورە بووە، باوکی لە ئەهلی عیلم و فەرموودە بوو، بۆیە گرنگی پێی داوە و وای لێکردووە گوێ بۆ فەرموودە بگرێ کە هێشتا منداڵە، وە ڕێی پێداوە بە گەشت کردن بۆ بغداد بۆ داواکردنی زانست کە تەمەنی لەو کاتەدا دە ساڵ تێپەڕی نەکردووە .

- علي بن احمد بن البسري وتی : ابو عبدالله **إِبْنُ بَطَّة** فەرمووی : باوکم لە بغداد چەند هاوبەشێکی هەبوو، وە لەناویاندا پیاوێك هەبوو بە ابو بکر دەناسرا، جا بە باوکمی وت : کوڕەکەت بنێرە بۆ بغداد تاکو گوێی لە فەرموودە بێت، وتی : کوڕەکەی من منداڵە. بۆیە وتی : من لەگەڵ خۆم دەیبەم .

جا بردمی بۆ بغداد، منیش چووم بۆ لای ابن منیع کە لەو کاتەدا فەرموودەی بەسەر دەخوێنرایەوە، هەندێکیان پێیان وتم : داوا لە شێخ بکە موعجەمەکەیت پێ بدا. منیش داوام لە کوڕەکەی کرد، یان لە کچەزاکەی، وتی : ئەو داوای درهەم دەکات - واتە لە بەرامبەر موعجەمەکەیدا - ، ئێمەش پێماندا، پاشان (کتاب المعجم) مان بەسەریدا خوێندەوە بە تاکەکەسی لە ماوەی دە ڕۆژدا، یان کەمتر یان زیاتر، وە ئەمەش لە ساڵی پانزەیەمیندا بوو، یاخود شانزەیەمین .

پاشان گەشتەکەی درێژەی کێشا بۆ داواکردنی زانست لە کاتێکدا کە گەورە بووبوو، جا زۆر گەشتی کرد بۆ مەککە، و الثغور، و بەصرە، وە جگە لەم ناوچانەش .

پاشان گەڕایەوە ناوچەکەی خۆی، وە خۆی لە خەڵکی داڕنی .

- القاضي ابو حامد احمد بن محمد الديلوي وتی : کاتێك ابو عبدالله **إِبْنُ بَطَّة** گەڕایەوە لە گەشتەکەی؛ لە ماڵەکەی مایەوە بۆ ماوەی چل ساڵ وە یەك ڕۆژیش لەو ماوەیە لە بازاڕ نەبینرا، وە نەبینرا افطار بکاتەوە جگە لە جەژنی قوربان و ڕەمەزان - والله اعلم واتە هەمیشە بە ڕۆژوو بووە - , وە فەرمانی دەکرد بە چاکە، وە مەواڵی خراپەیەکی پێ نەدەگەیشت ئیللا دەیگۆڕی .

وتی : وه گوێم له نصر بن الفرج البزار بوو دەیوت : چومه ژوورەوه بۆ لای ابو عبدالله **إِبْنُ بَطَّة** وه ئەو بەڕۆژوو بوو له ڕۆژێکی زۆر گەرمدا، جا بینیم سینگی لەسەر چینێکی شۆردراو دانابوو خۆی بەوه فێنك دەکردەوه .

## مامۆستاکانی :

گوێی له فەرموودە بووه له :

**١** - ابو بكر احمد القطيعي .

**٢** - ابو الفضل جعفر القافلاني .

**٣** - ابو بكر احمد بن سلمان النجاد .

**٤** - ابو بكر بن زیاد النيسابوري .

**٥** - ابو القاسم البغوي .

وه هەندێکی تر .

## قوتابییەکانی :

**١** - ابن شهاب العكبري .

**٢** - ابو اسحاق البرمكي .

**٣** - ابو عبدالله بن حامد البغدادي .

**٤** - ابو بكر الزاهد .

هەندێکی دیکەش .

## وەسف و پیاهەڵدانی زانایان لەسەری :

- **السمعاني** وتی : لە فەقیهی حەنبەلیەکان بوو، نوسراوانێکی بەسوودی نوسیوە .

- **ابن کثیر** وتی : یەکێکە لە زانایانی حەنبەلیەکان .

- **العتیقي** وتی : شێخێکی چاکەکار بوو، دوعای وەڵام دەدرایەوە .

- **الذهبي** وتی : **إِبْنُ بَطَّة** امام و پێشەنگ، عابد، فەقیه، فەرموودەناس، وە شێخی عێراق بوو .

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

الشيخ الإمام ابو عبدالله عبيدالله بن محمد بن محمد بن حمدان بن بطة العكبري رحمه الله فەرمووی :

سوپاس بۆ ئەو الله یەی کە نیعمەتەکانی خۆی بەسەرماندا ڕشتووە، وە منەتەکانی بۆمان بە دیار خستووە، وە کردوویەتی بە گەورەترین لە قەدردا، وە مەزنترین لە پلەدا : کە هیدایەتی داوین بۆ ناسینی خۆی، و دان نان بە پەروەردگارێتیەکەیدا، وە کردوومانی بە شوێنکەوتوانی دینی ڕاستەقینە، و بەرەی ڕێبازی ڕاست .

جا سوپاس بۆ ئەو سوپاسی دەکەین و ستایشی دەکەین لەبەر ئەوەی کە بۆمانی کردووە کە هیدایەتی داوین بۆ ئیسلام، وە فێری کردووین، و تەوفیقی داوتن بۆ سوننەت، جا ڕێنمایی کردووین و ئەوەشی فێر کردووین کە نەمان دەزانی، بۆیە فەزڵی الله بەسەرمانەوە گەورەیە .

وە سەڵاوات لەسەر محمد ی پێغەمبەری داوا وەرگیراو، و نێردراوە هەڵبژێردراوەکەی بێ، ناردوویەتی بۆ ئیقامە حوججە، و جێگیر کردنی تاکیەتی بۆ خۆی، وە بانگەواز کردن بۆی بە دانایی و ئامۆژگاری چاکەوە .

وە سوپاس بۆ الله لەبەر شەریعەتە دیارەکان، و سوننەتە پاکژ کەرەوەکان، وە ڕەوشتە بەرزەکان، وە سەلامی لەسەر بێ .

وه داوای تەوفیق لە الله دەکەین بۆ وتەی صەواب، و کردەوەی چاك، وە داوای لێ دەکەین کە ئەو مەبەستمان کە خۆمان پێوە ماندوو کردووە تەنها بۆ ڕووی خۆی بێ، وە بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی و خۆشەویستی ئەو بێ؛ تاکو لای ئەو هەوڵەکانمان سوپاس کراو بن، و پاداشتەکانمان لە لای ئەو بەردەست بن .

**دواتر :**

من داواکارم لە الله کە تەوفیقێك بداتە من و تۆ کە دەرگاکانی ڕاستی بۆ من و تۆ بکاتەوە، وە پارێزراوی بە نسیبی من و تۆ بکا لە هەڵەکردن، و ڕای هەڵە، ئەو رحیم و ودود ە، وە هەر چیەکی بوێت دەیکا .

من ئەوەم بینی کە خەڵکی بە گشتی تێی کەوتون و نیشانیان داوە، وە بەسەریان زاڵ بووە و ئەوانیش بە باشیان داناوە؛ لەو ئارەزووە ناشرینانە، و ئەو بۆچوونە قێزەونانە، وە تەحریف کردن و گۆڕینی سوننەتەکەیان، و گۆڕینی دینەکەیان؛ تا ئەوەی کە بووە هۆی جیا جیا بوونیان، وە کرانەوەی دەرگای بەڵا و کوێری بۆ سەر دڵەکانیان، و هەڵوەشاندنەوەی یەکگرتوویيان، و جیا جیا بوونی جەماعەتیان، جا کتێبی الله یان فڕێدایە دوای خۆیانەوە، وە نەزان و گومڕاکانیان کردە چەند خوایەك لە کار و بارەکانیاندا لە دوای ئەوەی کە لە لایەن پەروەردگاریانەوە عیلمیان بۆ هاتبوو.

مشتومڕ و ناکۆکیان بە کار هێنا بۆ ئەوەی کە بانگەوازی بۆ دەکەن، وە شاهێدیان لەسەر دا بە گومانەکانیان، و بەڵگەشیان هێنایەوە بە بوختان بۆ ئەو

شتەی کە بانگەشەی بۆ دەکەن، وە لە دینەکەیاندا لاسایی ئەوانەیان کردەوە کە نازانن و هیچ بەڵگەیەکیان پێ نیە نە لە کتێبی اللە، وە نە لە کۆدەنگیدا .

وە اللە چەندیانی وا لێکردووە لەو وتە گومڕاکەرانەی کە شەیتانەکان کردویانەتە سەر زمانی برا مولحیدەکانیان، وە لەو وتە ڕازێنراوانەی کە تازە و داهێنراو و بیدعەن .

شتانێك کە لە عەقڵەکان دەشێونرێن، و لە سینەکاندا بە ڕاستی ناڕۆن، جا هیچ مرۆڤێکیش لە دژیان بەرگە ناگرێ، و هیچ پێیەکیش بۆ ئەو خوار و خێچیە جێگیر نابێ، ئەو کەسە نەبێ کە اللە پاراستویەتی بە عیلم، وە جێگیری و نەرم و نیانی پێ بەخشیوە .

جا من لەم کتێبەدا لایەنێکم کۆکردۆتەوە لەوەی گوێمان لێی بووە، وە کۆمەڵێك لەو شتانەی کە نەقڵمان کردووە لە پێشەوایانی دین، و زانایانی موسڵمانانەوە، کە ئەوانیش لە پێغەمبەری پەروەردگاری جیهانیانەوە بۆیان نەقڵ کردووین کە ئەو ئیمانداراانەی شوێنی کەوتوون هانی ئەوانی تریان داوە لەسەری، وە فەرمانیان پێی کردووە بە : دەست گرتن بە سوننەتەکەیەوە، و گرتنی ڕێگاکەی، پابەند بوون بە ڕێنمونیەکەی، و کۆتایی هێنان بە ئاثارەکانی .

وە لەبەردەممدا : ئاگاداری دان لە شتە شازەکان، و ترساندن لە جیاکاریم پێشکەش کردووە .

لەگەڵ ئەو شتانەی کە اللە عز و جل فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ پێکردووە لە : پابەند بوون بە جەماعەتەوە، و دوور کەوتنە لە ئەهلی لادان و جیاجیایی و قێزەونی .

وە ئەوەش کە ئەهلی سوننە پابەند دەکا لە : دوورکەوتنەوە، و جیابوون لەو کەسەی کە جیاوازە لە بیر و باوەڕیان، و پەیمانی هەڵوەشاندۆتەوە، وە دەرچووە لە دینەکەیان، و مەبەستیشی ئەوە بووە کە جەماعەتەکەیان پەرتەوازە بکا .

## پاشان لە دوای ئەمە :

ڕوون کردنەوەی سوننەت لە کۆدەنگی پێشەوایانەوە، و لە یەکگرتنی ئوممەتەوە، وە لە ڕێککەوتنی ئەهلی دینەوە .

جا لەمانە شتانێکم کۆکردۆتەوە کە : نابێ موسڵمان نەزان بێ پێیان، وە الله تبارك و تعالى عوزر نادا بەوەی کە لە دەستی بدا، وە سەیری ئەوە ناکا کە سەرپێچی لەمانە دەکا و اقامە حوججە کراوە و گاڵتەی کردووە بە دین، وە پێی هەڵخلیسکاوە لە کاتێکدا پێشەوایانی موسڵمانان پێیان جێگیر بووە، وە لە ڕێنیشاندان کوێر بووە لەو کاتەی سەرپێچی سوننەی المصطفى و خەلیفە ڕێنیشاندەر و ڕێنمونیکارەکانی کردووە .

وە الله سەڵاوات برژێنێ بەسەر پێغەمبەر و خاو و خێزانە پاك و چاکەکەی، و هاوەڵە هەڵبژێردراوەکانی، وە هاوسەرەکانی و دایکانی ئیمانداران، وە بەسەر شوێنکەوتوانی چاکە، و شوێنکەوتوانی شوێنکەوتوان، لەوانەی سەرەتا و کۆتا هەتاکو ڕۆژی قیامەت، وە پشتیش بە الله دەبەستین .

پاشان براکەم الله تۆ تەوفیق بدا بۆ قبوڵ کردن، کارکردن بەم کتێبە : لەم کتێبەدا وازم لە سەنەدەکان هێناوە لەبەر ئەوەی کورت و پوخت بێ - واتە ئەثەرەکان و فەرموودەکانی بە بێ سەنەد نوسیوە - , وە عادل بوون بەرامبەر زۆری و دوور و درێژی؛ بۆ

ئەوەی ئاسان بێ بۆ ئەو کەسەی کە دەیخوێنێتەوە، و ئەوەش بێزار نەبێ کە دەیبیستێ و لەبەری دەکا .

والله ولي توفيقنا، و الآخذ بأيدينا، و هو حسبنا و نعم الوكيل .

# بەشی یەکەم

## باس کردنی ئەثەرەکان دەربارەی پابەندبوون بە سوننەت و زەمکردنی بیدعە



### یەکەم شت کە دەست دەکەین بە باسکردنی :

**١** - ئەوەیە کە الله عز و جل فەرمانی پێکردووە، و لە کتێبەکەیدا باسی کردووە لە : پابەندبوون بە جەماعەتەوە، و نەهی کردن لە پەرتەوازەیی؛ وە فەرموویەتی : ﴿وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا﴾ [آل عمران : ١٠٣] .

پاشان هەڕەشەی کردووە بە سزا لە هەر کەسێك کە جیا بووبێتەوە لە جەماعەتی موسڵمانان؛ وەکو فەرموویەتی : ﴿وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُواْ وَٱخْتَلَفُواْ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ [آل عمران : ١٠٥] .

جا الله تبارك و تعالی فەرمانی کردووە بە کۆبوونەوە لەسەر دینەکەی، و گوێڕایەڵی کردنی .

وه فەرموویەتی : ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُواْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلْقَيِّمَةِ﴾ [البينة : ٥] .

وه فەرموویەتی : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِهِۦ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَٰنٌ مَّرْصُوصٌ﴾ [الصف : ٤] .

---

: جەماعەت واتە كۆمەڵی موسڵمانان هەتا ئەو كاتەی شوێنی فەرموودەكان و ئاثاری هاوەڵان دەكەون و لەسەر حەقن تەنانەت ئەگەر تاقە كەسێكیش بوو، واتە بە پێی زۆرینە نیە، هەر وەكو لە **(الباعث على انكار البدع - ص ٩١)** هاتووە كە **معاذ بن جبل** فەرموویەتی : جەماعەت ئەوەیە لەگەڵ حەقدا یەك بێ ئەگەر چی بە تەنهاش بوویت .

وە **الترمذي** لە **(سنن - ٤/٤٦٦)** وتویەتی : وە تەفسیری جەماعەت لای ئەهلی علم ئەوەیە كە ئەوان : ئەهلی فیقهـ، و علم، و فەرموودەن .

وە **البربهاري** لە **(شرح السنة - ٣)** وتویەتی : وە ئەو بنچینەیەی كە جەماعەتی لەسەر بونیاد دەنرێ، هاوەڵانی محمد ن ﷺ، ڕەحمەتی الله لە هەموویان بێ، وە ئەوان ئەهلی سوننە و جەماعەن، جا هەر كەس لەوانەوە وەرنەگرێ ئەوا گومڕا بووە و بیدعەی كردووە، وە هەموو بیدعەیەك گومڕاییە، و هەموو گومڕاییەك و ئەهلەكەشی بۆ ئاگر.

**٢** - وە فەرمانی بە ئیمانداران كردووە بە جودا بوون لەو كەسانەی كە جیاوازن لە بیروباوەڕیان، وە لەوانەی كە پەیمانەكەیان هەڵوەشاندۆتەوە، وە توانجیان لە دینەكەیان داوە : بە دوور بوون لێیان، و وازهێنان لە دانیشتن لەگەڵیان، و گوێگرتن لە هەڵە و وتارەكانیان، وەكو فەرموویەتی : ﴿وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلْكِتَٰبِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ

ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكۡفَرُ بِهَا وَيُسۡتَهۡزَأُ بِهَا فَلَا تَقۡعُدُواْ مَعَهُمۡ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيۡرِهِۦٓ إِنَّكُمۡ إِذٗا مِّثۡلُهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱلۡكَٰفِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا﴾ [النساء: ١٤٠].

**٣** - وە رسول الله ﷺ دەربارەی ئەو سێ کەسەی کە دواکەوتن لێی - لە جەنگی تەبوك - فەرمانی کرد: بە قسە دابڕین، و جودا بوون لێیان، وە فەرمانی پێیان کرد کە لە ژنەکانیان دابڕێن هەتاکو الله عز و جل تەوبە کردنی ئەوانی دابەزاند.

---

: ئەوەی کە هاتووە دەربارەی قسە دابڕین کە دەڵێت لە دوای سێ ڕۆژ حەرامە ئەوەیان بۆ کاروباری دونیایە، واتە قسە دابڕین لەبەر دونیا جائیز نیە، بەڵام دابڕان لە کافران و گومڕایان لە سوننەتەوەیە، بەڵکو خۆ دانەبڕین لێیان دروست نیە بۆ کەسی سوننی.

**٤** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (یەکەم کەموکورتیەك کە کەوتە ناو نەوەکانی ئیسرائیلەوە ئەوە بوو: کە پیاو براکەی دەبینی و پێی دەوت: ئەی فڵان لە الله بترسە، و واز لەوە بێنە کە دەیکەیت؛ چونکە ئەوە بۆت حەڵاڵ نییە.

پاشان سبەینێ دەیبینیەوە؛ ئەو کارە ڕێگری لێ نەدەکرد کە بەشداری بکات لە خواردنەکەی، و خواردنەوەکەی، و دانیشتنی، جا کاتێك وایان کرد: الله دڵی دان بە یەکتردا).

پاشان الله فەرمووی : ﴿لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى لِسَانِ دَاوُودَ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ﴾ هەتاكو فەرمایشتی : ﴿وَلَكِنَّ كَثِيرًا مِنْهُمْ فَاسِقُونَ﴾ [المائدة: ٧٨ - ٨١] .

---

: واتە جولەکەکان یەکتریان دەبینی لەسەر مونکەر و نەهییان لێ دەکرد، بەڵام کە سبەینێ دەهات شتەکە لایان ئاسایی دەبووەوە و هیچ لەگەڵ یەکتر نەدەگۆڕان و وازیان لە دابڕان هێنابوو بۆیە الله ڕق و کینەی خستە ناویانەوە، والله اعلم .

٥ - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (نمونەی ئەو کەسەی کە بە فەرمان و سنورەکانی الله هەڵدەستێت، وە ئەو کەسەی بە فەرمان و سنورەکانی هەڵناستێت، وەکو نمونەی گەلێك وایە کە تیروپشکیان کرد لەسەر کەشتیەك کە لە دەریادایە، جا بەشێکیان قاتی خوارەوەیان بۆ دەرچوو، وە بەشێکیان سەرەوە، ئەوانەی لە خوارەوە بوون کە دەردەچوون بۆ ئاو خواردنەوە و تینوویەتی شکاندن، بەسەر ئەو کەسانەی سەرەوەدا دەڕۆیشتن و ئازاریان دەدان، بۆیە ئەوانەی سەرەوە وتیان : لێتان ناگەڕێین بەسەرماندا بڕۆن و ئازارمان بدەن، ئەوانەی خوارەوەش وتیان : ئەگەر ڕێمان لێبگرن؛ ئەوا کونێك دەکەینە کەشتیەکەوە لە بەشی خوارەوەی وە ئاو دەخۆینەوە لێیەوە.

فەرمووی : جا ئەگەر دەستیان بگرن و ڕێیان لێ بگرن - لە کونکردن - ؛ ئەوا هەموویان ڕزگاریان دەبێ، وە ئەگەر وازیان لێ بهێنن، ئەوا هەموویان دەمرن) .

٦ - پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (نەوەکانی ئیسرائیل دابەش بوون بۆ سەر حەفتا و دوو کۆمەڵە، وە ئوممەتی منیش دابەش دەبێ بۆ سەر حەفتا و سێ کۆمەڵە : یەك کۆمەڵەیان ڕزگاری دەبێ، و حەفتا و دوو کۆمەڵە لە ئاگردا دەبن) .

٧ - وە فەرمووی ﷺ : (دەست بگرن بە سوننەتی من و خەلیفە ڕاشدینەکانی دوای من؛ وە قەپی پێدا بکەن بەخرێکانتان) .

---

: واتە ددانەکانی دواوە، کە مەبەستی توند دەست پێوەگرتنیەتی .

٨ - وە فەرمووی ﷺ : (بە سپێتی و بێ خەوشی بۆم هێنان؛ بۆیە لە دوای من جیاوازیتان تێ نەکەوێت) .

٩ - وە فەرمووی ﷺ : (بەڕاستی لەسەر ڕێگایەکی ڕوون بەجێم هێشتوون؛ جا بە لای ڕاست، و چەپدا مەڕۆن) .

١٠ - وە فەرمووی ﷺ : (الله بەندە دەخاتە بەهەشتەوە بەو سوننەتەی کە دەستی پێوە گرتووە) .

١١ - وە فەرمووی ﷺ : (والله ئەگەر موسا و عیسا زیندوو بان؛ ئەوا هیچیان بۆ حەڵاڵ نەبوو جگە لەوەی شوێنم بکەون) .

**١٢** - وه ئەو ﷺ چووه دەرەوه بۆ لای هاوەڵانی و ئەوان ناکۆکییان هەبوو لە بارەی قەدەرەوه، بۆیه فەرمووی : (ئایا بەمه فەرمانتان پێکراوه؟! مەگەر لەمه نەهیتان لێ نەکراوه؟! به ڕاستی ئەوانەی پێش خۆتان به هیلاکدا چوون به هۆی مشت و مڕیان له دینەکەیاندا) .

**١٣** - وه ئەو ﷺ ڕۆژێك چووه دەرەوه بۆ لای هاوەڵانی و ئەوان دەیان وت : ئایا الله ئاوا و ئاوای نەفەرمووه؟ هەندێکیان ڕەددی هەندێکی تریان دەدایەوه، جا پێغەمبەر ﷺ وەکو ئەوه وابوو دەنکە هەنارێکت به ڕوویدا تەقاندبێ - واته سورهەڵگەڕابوو له توڕەییدا - , بۆیه فەرمووی : (بەڕاستی ئەمه بوو ئوممەتەکانی تری تێکدا، بۆیه بەشێکی کتێبی الله به گژ بەشێکی تریدا مەدەن؛ چونکه ئەوه گومان له دڵەکانتاندا دادەنێت) .

**١٤** - وه فەرمووی ﷺ : (لەگەڵ ئەهلی قەدەر دامەنیشن؛ چونکه ئەوان مشتومڕ له بارەی ئایەتەکانی الله عز و جل دەکەن) .

---

: فەرموودە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەربارەی فرقە گومڕاکان تەنیا بۆ خەواریج صحیحە، والله اعلم .

**١٥** - وه فەرمووی ﷺ : (مشتومڕ کردن له قورئاندا کوفره) .

**١٦** - وه فەرمووی ﷺ : (ئێوه ناگەڕێنەوه بۆ لای الله عز و جل به شتێکی باشتر لەوەی که له خۆی دەرچووه) .

واته : قورئان .

---

: **البخاري** دەڵێ صحيح نييه . بەڵام واتاكەی صحيحه **عبدالله** له (**السنة - ٩٣**) به سەنەدێكی صحيح له **خباب**ەوە رضي الله عنه مێناويەتی .

**١٧** - وە فەرمووی ﷺ : (قورەیش رێگریان لێكردم لەوەی كەلامی پەروەردگارم بگەیەنم) .

**١٨** - وە به جابری فەرموو ﷺ : (ئايا زانيوته الله عز و جل باوكتی زيندوو كردەوە و ڕاستەوخۆ به بێ پەردە قسەی لەگەڵدا كرد؟!) .

**١٩** - وە فەرمووی ﷺ : (له دوای من فيتنەيەك دێت كه پياو بەيانی دەكاتەوە به ئيمانداری، و ئێوارە دەكاتەوە به كافری، وە ئێوارە دەكاتەوە به ئيمانداری، و بەيانی به كافری؛ جگه له كەسێك كه الله به علم زيندووی كردبێتەوە) .

**٢٠** - وە فەرمووی ﷺ : (پابەند بن بەوانەی دوای منەوە : ابو بكر و عمر رضي الله عنهما) .

**٢١** - وە فەرمووی ﷺ : (بەردەوام كار و باری نەوەی ئيسرائيل به ڕێك و پێكی دەڕۆيشت هەتاكو ئەو منداڵانەی كه له دايكە كەنيزەكەكان بووبوون تێياندا

گەشەیان کرد و دەرکەوتن، جا ڕا و بۆچوونیان وەرگرت، و وازیان لە سوننەتەکان هێنا)
.

**٢٢** - وە فەرمووی ﷺ : (الله علم لانابات بە لابردنی لە سینگی پیاواندا؛ بەڵکو علم لە ناو دەبات بە لە ناو بردنی زاناکان، جا ئەگەر هیچ زانایەك نەمایەوە؛ ئەوا خەڵکی سەرانێکی نەزان دەکەنە زانا و ئەوانیش پرسیاریان لێ دەکرێ؛ جا بە بێ علم فتوا دەدەن؛ وە گومڕا دەبن و خەڵکیش گومڕا دەکەن) .

**٢٣** - وە پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لە : وتی وتی، و بەفیڕۆدانی سامان، و زۆر پرسیارکردن .

**٢٤** - وە ئەو ﷺ ڕقی لە زۆر پرسیارکردن بوو .

**٢٥** - وە ئەو ﷺ نەهی کردووە لە پرسیارکردن لەو شتانەی کە پێویست بە زانینی ناکات .

**٢٦** - وە وتراوە : ئەوانە لە توندترینی مەسەلەکان و قورسترینیانن .

**٢٧** - وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (وازم لێ بهێنن لەوەی کە من تێیدا وازم لێهێناون) .

---

: لە (**جامع بيان العلم - ٢٠٨٣**) هاتوە کە **الأوزاعي** وتویەتی : ئەگەر الله تعالى بیەوێ بەندەیەکی خۆی بێ بەش بکا لە بەرەکەتی علم؛ ئەوا شتانێك دەخاتە سەر زمانی کە هیچ پێویست نییە بزانێ چۆنە و چۆن نییە. جا دەبینی ئەو جۆرە کەسانە کەمترین علمییان پێیە .

**٢٨** - وە فەرمووی ﷺ : (گەورەترین تاوانی موسڵمانان بەرامبەر موسڵمانان ئەوەیە : کە کەسێك پرسیار بکات لە بارەی شتێکەوە کە حەرام نەکرابێت، پاشان حەرام بکرێت بە هۆی پرسیارکردنەکەی ئەوەوە) .

**٢٩** - وە فەرمووی ﷺ : (هەر کەس شتێك دابهێنێت - واتە داهێنان لە دین - ، یان داڵدەی داهێنەرێك بکات ئەوا لەعنەتی الله، و لەعنەتی لەعنەتکاران، و مەلائیکە، و هەموو خەڵکی لێ بێت، الله نە فەڕزی لێ وەردەگرێ و نە نافیلە - نافیلە واتە سوننەتەکان - ) .

جا بە الحسن یان وت : داهێنان چییە؟

وتی : هاوەڵانی فیتنە هەموویان داهێنەرن، وە ئەهلی هەوا و ئارەزوو هەموویان داهێنەرن .

**٣٠** - وە فەرمووی ﷺ : (سەگەکانی ناو ئاگر : ئەهلی بیدەعن) .

**٣١** - وە فەرمووی ﷺ : (هەر کەس خاوەن بیدعەیەك بە گەورە ڕابگرێ و ڕێزی بگرێت؛ ئەوا یارمەتی داوە لەسەر ڕووخاندنی ئیسلام) .

---

: ئەهلی علم لە بارەی ئەم فەرموودەیەوە جیاوازیان هەیە لەسەر ئەوەی صحیح بێ یان نا، بەڵام مەتنەکەی لە زۆرێك لە تابعین ەوە بە صحیحی هاتووە .

**٣٢** - وە ابن مسعود رضي الله عنه فەمووی : ڕۆژێکیان رسول الله ﷺ خەتێکی بۆ کێشاین، پاشان فەرمووی : (ئەمە ڕێگای الله یە). دواتر چەند خەتێکی تری لە ڕاست و چەپی خەتەکەوە کێشا، و فەرمووی : (ئەمەش ڕێگاکانە، لەسەر هەر ڕێگایەك لەمانە شەیتانێك هەیە بانگەوازی بۆ دەکات). پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ﴾ [الأنعام : ١٥٣] .

واتە : ئەو خەتانەی کە لای ڕاست و چەپی بوون .

**٣٣** - وە عائشة رضي الله عنها فەرمووی : رسول الله ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ مِنْهُ ءَايَٰتٌ مُّحْكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٌ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنْهُ ٱبْتِغَآءَ ٱلْفِتْنَةِ وَٱبْتِغَآءَ تَأْوِيلِهِۦ﴾ [آل عمران : ٧] .

فەرمووی : گوێم لە رسول الله ﷺ بوو دەیفەرموو : (ئەگەر ئەوانەتان بینی کە موجادەلەی تێدا دەکەن، ئەوە ئەو کەسانەن کە الله مەبەستی - لە باسکردنیان - بووە، جا ئاگاداریان بن) .

---

: مەبەستی ئەو کەسانەیە کە موجادەلە دەکەن لە بارەی ئایەتە موتەشابیهەکان، والله اعلم .

**٣٤** - وە فەرمووی ﷺ : (هیچ قەومێك گومڕا نەبوونەتەوە لە دوای ئەوەی لەسەر هیدایەت بوون ئیللا تووشی موجادەلە هاتوون) .

پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًا بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ﴾ [الزخرف : ٥٨] .

**٣٥** - وە فەرمووی ﷺ : (دەستگرتوو بە سوننەتەکەی منەوە لە کاتی تێکچوونی ئوممەتەکەم پاداشتی پەنجا شەهیدی هەیە) .

---

: صحیح نییە، سەنەدەکەی مرسل ە، وە بە لەفزێکی تریش هاتووە و ئەویش سەنەدەکەی منقطع ە .

**٣٦** - وە فەرمووی ﷺ : (دەستگرتوو بە دینەکەیەوە لە کاتی تێکچوونی خەڵکی وەکو کەسێکە پشکۆی گرتبێت) .

---

: صحیح نییە، الترمذي دەڵێ : ئەم فەرموودەیە غەریبە لەم ڕووەوە .

**٣٧** - وە فەرمووی ﷺ : (دەستگرتوو بە دینەکەیەوە لە ڕۆژانی کوشتن و کوشتاردا، وەکو ئەو کەسەیە کە کۆچ بۆ لای من دەکا) .

**٣٨** - وە فەرمووی ﷺ : (ئیسلام بە نامۆیی دەستی پێکرد، وە نامۆ دەبێتەوە هەروەکو ئەو کاتەی کە دەستی پێکرد؛ جا خۆشبەختی بۆ نامۆکان) .

وتیان : یا رسول الله ﷺ، نامۆکان کێن؟

فەرمووی : (ئەوانەن کاتێك خەڵکی تێك چوون و خراپ بوون ئەوان چاك دەبن).

**٣٩** - وە رسول الله ﷺ فەرمووی : (الله الله دەربارەی هاوەڵانم، مەیانکەنە ئامانجی خۆتان لە دوای من - واتە جنێویان پێمەدەن، والله اعلم - ، هەر کەس خۆشی بوێن ئەوا بە خۆشەویستی خۆم خۆشم دەوێ، وە هەر کەس ڕقی لێیان بێ ئەوا بە ڕق لێبوونەوەم ڕقم لێیەتی، وە هەر کەس ئازاریان بدات ئازاری منی داوە، وە هەر کەس ئازاری من بدا ئازاری الله ی داوە، وە هەر کەس ئازاری الله بدات ئەوا گومان وایە کە الله بیگرێت) .

**٤٠** - وە فەرمووی ﷺ : (جنێو بە هاوەڵانم مەدەن، سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە ئەگەر یەکێك لە ئێوە هێندەی ئوحود ئاڵتون ببەخشێت ناگاتە مُدّ یَکی ئەوان، یان نیوەی) .

---

: المُدّ لای ئەهلی حیجاز رِطل یێك و سێیەکی رطل یێکە، کە رطل یێکیش **١٢** ئۆقیەیە، و هەر ئۆقیەیەکیش **١٢** درهەمە، واتە ئەوەی لەم فەرموودەیە هاتووە دەکاتە **١٩٢** درهەم یان نیوەی، والله اعلم.

**٤١** - وە معاذ رضي الله عنه فەرمووی : پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو : (ئەی معاذ، گوێڕایەڵی هەموو کاربەدەستێك بکە، وە نوێژ لە پشتی هەموو پێش نوێژێك بخوێنە، وە جنێو مەدە بە هیچ کام لە هاوەڵانم) .

---

: صحيح نييە، سەنەدەکەی منقطع ە .

**٤٢** - وە رسول الله ﷺ دەستی لەسەر ڕیشی عمر بن الخطاب دانا، و فەرمووی : (ئەی عمر، إنا لله و إنا إليه راجعون) .

عمر رضي الله عنه فەرمووی : وتم : بەڵێ بە دایکم و باوکمەوە بەقوربانت بم یا رسول الله، إنا لله و إنا إليه راجعون، ئەمە واتای چی بوو؟

فەرمووی : (هێندە نابێت جبریل علیه السلام هات بۆ لام، پێمی فەرموو : ئەی محمد، إنا لله و إنا إليه راجعون، ئوممەتەکەت توشی فیتنە دەبن لە دوای تۆ بە ماوەیەکی کەم .

وتم : ئەی جبریل، فیتنەی گومڕاییە، یان فیتنەی کوفر ؟

فەرمووی : هەموویان دەبێت .

وتم : چۆن گومڕا دەبن و کوفر دەکەن، کە من لە دوای خۆمەوە کتێبی الله م بۆ جێهێشتوون؟

فەرمووی : بە کتێبی الله گومڕا دەبن؛ هەموو قەومێك بە هەوا و ئارەزووی خۆیان لێکی دەدەنەوە جا گومڕا دەبن) .

**٤٣** - وە الحسن البصري وتی : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (نمونەی هاوەڵانم وەکو نمونەی خوێیە لە خواردندا) پاشان وتی : هیهات، خوێی گەلەکە ڕۆیشت .

---

: صحيح نييه، سەنەدەكەى منقطع ە .

**٤٤** - وتى : وە پێغەمبەر ﷺ هاتە ناو مزگەوتەوە وە ابو بكر رضي الله عنه لە لاى ڕاستيەوە بوو، وە عمر رضي الله عنه لە لاى چەپيەوە بوو، جا فەرمووى : (بەم شێوەيە زيندوو دەكرێينەوە لە ڕۆژى قيامەت، وە بەم شێوەيە دەچينە بەهەشتەوە) .

**٤٥** - وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووى : (هيچ پێغەمبەرێك نييە ئيللا دوو وەزيرى هەيە لە ئەهلى ئاسمان، وە دوو وەزيريش لە ئەهلى زەوى؛ جا وەزيرەكانم لە ئەهلى ئاسمان : جبريل و ميكائيل ن، وە وەزيرەكانم لە ئەهلى زەوى : ابو بكر و عمر ن رضي الله عنهما).

**٤٦** - وە فەرمووى ﷺ : (خۆشەويستى ئەم چوارە لە دڵى ئيماندارێكى تەقوادار نەبێ جێگير نابێت : ابو بكر، و عمر، و عثمان، و علي رضي الله عنهم) .

**٤٧** - وە فەرمووى ﷺ : (الله خۆشەويستى : ابو بكر، و عمر، و عثمان، و علي رضي الله عنهم فەڕز كردووە لەسەرتان، هەروەكو چۆن : نوێژ، و زەكات، و ڕۆژوو، حەجى لەسەرتان فەڕز كردووە، جا هەر كەس ڕقى لە يەكێكيان بێت؛ ئەوا الله بيخاتە ئاگرەوە) .

---

: صحيح نيە، چونكە لە سەنەدەكەى احمد بن نصر الذارع هەيە كە **الدارقطنى** لە (**الميزان** - **٣٠٨/١**) لە بارەيەوە دەڵێ : دەجالە، كونيەكەى ابو بكر ە .

**٤٨** - وه فەرمووی ﷺ : (هەر کەس جوێن بە هاوەڵانم بدات ئەوا لەعنەتی الله، و لەعنەتی لەعنەتکاران، و مەلائیکە، و هەموو خەڵکی لەسەر بێ) .

: صحيح نيه، چونكه له سەنەدەکەی ابو شيبة الجومري هەیە، کە ابو حاتم لە (**الجرح و التعديل - ٢١٨/٩**) پێی دەڵێ : فەرموودەکانی ضعيف ە .

**٤٩** - وه فەرمووی ﷺ : (جنێو به هاوەڵانم مەدەن؛ چونکە قەومێك دێن لە ئاخر زەمان جنێو به هاوەڵانم دەدەن؛ نوێژیان لەسەر مەکەن، و لەگەڵیان نوێژ مەکەن، و نیکاحیان لەگەڵ مەکەن، وە لەگەڵیان دامەنیشن، وە ئەگەر نەخۆشیش کەوتن سەردانیان مەکەن) .

**٥٠** - ابن عباس رضي الله عنهما فەرمووی : جنێو به هاوەڵانی محمد ﷺ مەدەن، چونکە الله فەرمانی کردووە بەوەی داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکرێ، وە دەشیزانی کە ئەوان شەڕ دەکەن .

**٥١** - وه عائشة رضي الله عنها فەرمووی : فەرمانیان پێکرا بەوەی داوای لێخۆشبوون بۆ هاوەڵانی محمد ﷺ بکەن، کەچی جنێویان پێدان .

**٥٢** - وه ابو بكر الصديق رضي الله عنه فەرمووی : چ ئاسمانێك دامدەپۆشێت، وە چ زەوییەك هەڵم دەگرێ ئەگەر شتێکم وت لە بارەی کتێبی الله کە نایزانم .

**٥٣** - وە ابو بكر الصديق رضي الله عنه فەرمووی : سوننەت گوریسی بەهێزی الله یە، جا هەر کەس وازی لێ هێنا؛ ئەوا گوریسەکەی بچڕاوە لە الله ـوە .

---

: گوریسی الله لە (**تفسير الطبري**) بە چەند شتێك تەفسیر کراوە لەوانە : ئەو هۆکارەی کە بەندە بە هۆیەوە دەگات بە پێویستی و ویستەکانی، یان قورئان و ئەو پەیمانەی کە لە بەندە وەرگیراوە، یان ئیسلام، یان پوختیەتی تەوحید بۆ الله .

**٥٤** - عمر بن الخطاب رضي الله عنه فەرمووی : هاوەڵانی ڕا و بۆچوون دوژمنی سوننەتەکانن؛ فەرموودەکانیان بۆ لەبەر ناکرێت، وە لێیان تێکدەچێت و بیریان دەچێتەوە جا ناتوانن لەبەریان بکەن؛ بۆیە بە ڕا و بۆچوون قسە دەکەن، وە گومڕا دەبن و خەڵکیش گومڕا دەکەن .

**٥٥** - وە عمر رضي الله عنه فەرمووی : قورئان کەلامی الله یە عز و جل، جا واتاکەی بۆ غەیری خۆی مەگۆڕن .

**٥٦** - وە عمر رضي الله عنه فەرمووی : الله عز و جل فەرمانی بە بەندەکانی نەکردووە ئیللا بە شتێك نەبێ کە سودی بۆیان هەیە، وە نەهی لێیان نەکردووە ئیللا لە شتێك نەبێ کە زیانی بۆیان هەیە .

**٥٧** - وە عثمان رضي الله عنه فەرمووی : باتڵ ئەوەیە کە لەگەڵ نەفسدا ڕێك دەکەوێت، ئەگەر چی گوێڕایەڵیشت تێیدا بینی بۆ الله عز و جل .

---

: والله اعلم واته ئەگەر نیەتیشت پاك بوو بەڵام كارەكەت لەسەر سوننەت نەبوو مەیكە چونكە باتڵە و لە نەفسی خۆتەوە كردووتە .

**٥٨** - وە علي بن ابي طالب رضي الله عنه فەرمووی : هەوا و ئارەزوو ڕێگری لە حەق دەكات .

**٥٩** - وە علي رضي الله عنه فەرمووی : هەوا و ئارەزوو لای سەرپێچیكاری سوننەت حەقە، تەنانەت ئەگەر لە پێناویشیدا لە ملی بدرێت .

**٦٠** - وە ابن عباس رضي الله عنهما فەرمووی : بەشێك لە كتێبی الله عز و جل بە گژ بەشێكی تریدا مەدەن .

**٦١** - وە عمر رضي الله عنه جەڵدی الصبیغ التمیمي كرد لەبەر پرسیاركردنی لەبارەی چەند پیتێك لە قورئان .

---

: لە **سلیمان بن یسار**ەوە : پیاوێك پێی دەوترا : صبیغ، هات بۆ مەدینە و دەستی كرد بە پرسیار كردن لەبارەی ئایەتە موتەشابیهەكانی قورئانەوە، بۆیە عمر رضي الله عنه ناردی بە شوێنیدا و چەند چڵە دارخورمایەكیشی بۆ ئامادە كردبوو، فەرمووی: تۆ كێی؟ وتی : من بەندەی الله صبیغ م . جا عمر چڵێك لە دارخورماكانی هەڵگرت و لێیدا، و فەرمووی : منیش بەندەی الله عمر م . هەر لێیدا هەتاوەكو سەری خوێنی لێ هات . بۆیە وتی : ئەی پێشەوای بڕوادارن بەسە ئەوە نەما كە لە سەرمدا هەبوو . (**سنن الدارمي [١٤٦ و ١٥٠]**) .

جا هەندێك كەس وا تێدەگەن ئاخۆ پرسیار كردن دەربارەی قورئان بۆ ئەوەی بزانێت لێكدانەوەكەی چییە ئەمە پاداشتەكەیەتی؟! بەم شێوەیە نیە چونكە كاتێك كە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی كرد،

خەڵکی پرسیاریان لە خەلیفە ڕاشیدەکان دەکرد بۆ ئەوەی شارەزای دینەکەیان بن و ئەوەی فەڕزە لەسەریان بیزانن و بیکەن و ئەوەش حەرامە و نەهی لێکراوە خۆیانی لێدوورخەنەوە، ئەمەش کە گەیشتەوە بە امام عمر کە ئەم کەسە پرسیار لە موتەشابیهەکانی قورئان دەکا و لە شتانێك دەگەڕێ کە پێویستی پێ نابێ ئەگەر بیزانێ و زیانیشی ناگا ئەگەر نەیزانێ، کەچی وازی لەوانە هێناوە کە پێویستیەتی و ئەگەر نەیزانێ زیانی لێدەدا، بۆیە امام عمر لێی دا چونکە لێی ئەمین نەبوو کە ئەم کەسە توشی زەیغ و لادانی دڵ نەبێ لەبەر ئەوەی الله دەفەرموێ : ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ﴾ [آل عمران : ٧] .

واتە : ئەوانەی زەیغ و لادان لە دڵیان هەیە دەچن شوێنی موتەشابیهەکان دەکەون بۆ ئەوەی فیتنە و ئاشووب بنێنەوە یاخود دەیانەوێ لێکی بدەنەوە .

**٦٢** - وە ابن مسعود رضي الله عنە فەرمووی : ئەگەر بیستت الله عز و جل ئاوا و ئاوا دەفەرموێ؛ ئەوا گوێی بۆ بگرە، چونکە یان خێرێکە و فەرمانت پێی دەکرێ، یان شەڕێکە و نەهیت لێی دەکرێ .

**٦٣** - وە ابن مسعود فەرمووی : قورئان کەلامی الله یە عز و جل، جا هەر کەس لەبارەیەوە هەر شتێکی وت ئەوا بە ناوی الله ـوە دەیڵێت .

**٦٤** - وە ابن عمر رضي الله عنە فەرمووی : هەر کەس واز لە سوننەت بهێنێت کوفری ئەنجام داوە .

---

: **مكحول** دەڵێ : سوننەت دوو دانەیە : وەرگرتنی سوننەتێکیان فەڕزە، و وازلێهێنانی کوفرە، وە وەرگرتنی سوننەتەکەی دیکەیان فەزیڵەتە، وە بە وازهێنان لێی هیچت لەسەر نییە . **سنن الدارمي** [٦٠٩] .

جا ئەوەی فەرزە بریتیە لەوەی کە وەکو تەفسیرێك بۆ کۆمەڵە فەرزێکی ناو قورئان هاتووە کە چۆنێتی کردنەکەی نازانرێ ئیللا بە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ نەبێ، واتە ئەبێ وەکو ئەو بیکەی چونکە سوننەت واتە ڕێباز، بۆ نمونە نوێژ و ڕۆژوو و حەج و جیهاد و ..متد لە قورئاندا هاتوون کە فەرزن بەڵام ئەوە سوننەتی رسول الله یە ﷺ کە ڕوونی کردوەتەوە چۆن بکرێن، جا ئەگەر واز لەمە بهێنرێت ئەوا دەبێتە کوفر، بەڵام ئەوەی دیکەیان نافیلەکانە بۆ نمونە شەونوێژ ئەگەر بیکەی خێرە ئەگەر نەشی کەیت هیچت لەسەر نییە، هەر چەندە هەندێك لە زانایان بەلایانەوە خراپ بووە کە بە تەواوی واز لەمانەش بهێنرێ، والله اعلم .

**٦٥** - عمر بن عبدالعزیز وتی : سوننەت کەسێك دای ڕشتووە کە زانیویەتی چی هەڵە و تاوان تێدایە لە پێچەوانەکەیدا، وە ئەوان لە ئێوە بە تواناتر بوون لەسەر ناکۆکی و موجادەلە کردن .

---

: والله اعلم، مەبەستی ئەوەیە پێغەمبەر ﷺ سوننەتی فێری هاوەڵان کرد و ئەوانیش وەکو خۆی شوێنی کەوتن، خۆ دەیان توانی وەکو ئێمە ناکۆکی و موجادەلەی تێدا بکەن بەڵام نەیان کرد چونکە دەیانزانی لە پێچەوانەی سوننەت چی هەڵە و تاوانێك بوونی هەیە .

**٦٦** - وە پیاوێك بە ابن عباس ی وت : سوپاس بۆ ئەو الله یەی کە ئارەزووی ئێمەی لەسە ئارەزووی ئێوە داناوە - واتە موافەقەی ئارەزووی ئێوە دەکات - .

ابن عباس رضي الله عنهما پێی فەرموو : الله عز و جل لەم ئارەزووانەدا هیچ شتێکی خێری دانەناوە؛ وە ناونراوە ئارەزوو - هَوًى - ، لەبەرئەوەی خاوەنەکەی فڕێ دەداتە ناو ئاگرەوە .

**٦٧** - الحسن، و مجاهد بن جبر، و ابو العالية وتیان : ناونراوە ئارەزوو - هَوًى - ، چونکە خاوەنەکەی فڕێ دەداتە ناو ئاگرەوە .

**٦٨** - الحسن وتی : هیچ دەردێك نییە سەختتر بێت لەوەی کە ئارەزوو تێکەڵ بە دڵێك بێت .

**٦٩** - ابو قلابة وتی : ئاگاداری هاوەڵانی مشتومڕ بن؛ چونکە من ئەمین نیم لەوەی کە توشی گومڕاییەکەی خۆیانتان نەکەن، یاخود سەرتان لێ نەشێوێنن لە هەندێك لەوەی کە دەیزانن .

**٧٠** - وە عطاء، و طاووس، و مجاهد، و الشعبي، و ابراهیم رحمهم الله ڕقیان لێبووە فتوا بدەن لە شتێك لە مشتومڕدا؛ وە وتیان : مشتومڕ دین بەتاڵ دەکاتەوە .

وە وتیان : هەرگیز هیچ خاوەن وەرعێك مشتومڕی نەکردووە .

**٧١** - وە عمران بن الحصین رضي الله عنه فەرمووی : (شەرم لە ئیمانەوەیە) .

پیاوێکیش کە لەلای بوو وتی : لە داناییدا نوسراوە : لە شەرمدا لاوازی هەیە، وە تێیدا شکۆمەندیش هەیە .

عمران فەرمووی : من لە رسول الله وە ﷺ بۆت باس دەکەم، تۆش ئەوەی ناو پەڕاوەکەتم بۆ باس دەکەی؟! هەرگیز قسەت لەگەڵ ناکەم .

**٧٢** - وە لای عمران بن الحصين رضي الله عنه فەرموودەیەك باسکرا؛ پیاوێك لەو کۆمەڵەیە وتی : ئەگەر سورەتێکی کتێبی الله تان بخوێندایەتەوە باشتر بوو لەو فەرموودەیەتان .

عمران فەرمووی : تۆ گەمژەیت، ئایا نوێژ بە تەفسیرکراوی لە کتێبی الله دا دەدۆزیتەوە؟، ئایا زەکات بە تەفسیرکراوی لە کتێبی الله دا دەدۆزیتەوە؟، قورئان حوکمەکەی داوە، سوننەتیش تەفسیری کردووە .

**٧٣** - المقدام بن معدي کرب رضي الله عنه فەرمووی : رسول الله ﷺ لە ڕۆژی غەزای خەیبەردا چەند شتێکی حەرام کرد، پاشان فەرمووی : (گومان وایە پیاوێك لەسەر قەنەفەکەی بێت، ئەوەی بۆ بێت کە من فەرمانم پێکردووە یان نەهیم لێکردووە، وە بڵێت : واز لەمە بێنن، نازانین ئەمە چییە، دەست بگرن بە کتێبی الله وە، جا من ئەو پیاوە لە ناو ئێوەدا نەناسم) .

---

: مەبەست لەم فەرموودەیە ئەو جاهیلانەن کە بە ئیسراحەت دانیشتوون و تانە لە فەرموودە دەدەن، و دەڵێن بەس شوێنی قورئان دەکەوین، جا کە فەرموویەتی ئەو پیاوە لە ناو ئێوەدا نەناسم واتە کەستان قسەکەی ئەو نەکەنەوە و نەڵێن بەس شوێنی قورئان دەکەوین و واز لە فەرموودە دێنین، والله اعلم .

**٧٤** - پیاوێك به ابن عمر ی رضي الله عنه وت : ڕات چییه؟ ڕات چییه؟

ابن عمر فەرمووی : ڕات چییه بخه لای ڕاستەوه، چونکه ئەمه سوننەته .

: واته واز له ڕای من بێنه، ئەوەتا سوننەت شوێنی بکەوه .

**٧٥** - الشعبي وتی : هەرگیز بڕیارم به ڕا و بۆچوون نەداوه .

**٧٦** - وه قتادة وتی : فتوام به ڕا و بۆچوون نەداوه بۆ ماوەی سی ساڵ .

**٧٧** - الحسن وتی : خراپترین بەندەکانی الله ئەوانەن که شوێنی خراپترین مەسەلەکان دەکەون، بۆ ئەوەی بەندەکانی الله ی پێ چەواشه بکەن .

**٧٨** - وه میمون بن مهران دەربارەی فەرمایشتی الله : ﴿فَإِن تَنَٰزَعْتُمْ فِى شَىْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾ [النساء : ٥٩]، وتی : گێڕانەوه بۆ لای الله : بۆ لای کتێبەکەیەتی، وه گێڕانەوه بۆ لای پێغەمبەر ﷺ که وەفاتی کرد : بۆ لای سوننەتەکەیەتی .

**٧٩** - عکرمة وتی : ﴿أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَأُو۟لِى ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ﴾ [النساء : ٥٩]، وتی : ابو بكر و عمر رضي الله عنهما .

**٨٠** - وه يحيى بن ابي كثير وتی : سوننەت دادوەره بەسەر قورئانەوه، بەڵام قورئان دادوەر نییه بەسەر سوننەتەوه .

: **ابن قتيبة** له (**تأويل المختلف الحديث - ص١٩٩**) دەڵێت : مەبەستی ئەوەیە ڕوونكەرەوەی كتێبی الله یە و ڕاگەیەنەری ئەوەیە كە الله مەبەستی بووە .

**٨١** - وە حسان بن عطية وتی : جبريل عليه السلام سوننەتی دادەبەزاندە سەر رسول الله ﷺ هەروەكو چۆن قورئانی دادەبەزاندە سەری، وە سوننەتی فێر دەكرد هەروەكو چۆن قورئانی فێر دەكرد .

**٨٢** - وە سعيد بن جبير دەربارەی فەرمایشتی الله عز و جل : ﴿وَعَمِلَ صَالِحًا ثُمَّ اهْتَدَى﴾ [طه : ٨٢]، وتی : پابەندبوون بە سوننەت و جەماعەت .

**٨٣** - لە قتادة وە دەربارەی فەرمایشتی الله تعالى : ﴿وَٱذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِى بُيُوتِكُنَّ مِنْ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ وَٱلْحِكْمَةِ﴾ [الأحزاب : ٣٤]، وتی : قورئان و سوننەت .

**٨٤** - لە مجاهد ەوە : باشترین بەندایەتی : چاكییەتی ڕا و بۆچوونە، واتە : سوننەت .

**٨٥** - وە اسحاق بن عيسى وتی : گوێم لێبوو كە مالك بن انس موجادەلە و موناقەشەی دەربارەی دین عەیبدار دەكرد، وە دەیوت : هەر كاتێك پیاوێك هاتبێت بۆ لامان كە موجادەلەكەرتر بێ لە پیاوێكی تر، ئەوا ویستویەتی واز لەوە بهێنین كە جبريل عليه السلام بۆ پێغەمبەری ﷺ هێناوە .

**٨٦** - وە ابن سيرين وتی : پیاو بیدعەیەكی وەرنەگرتووە دواتریش گەڕابێتەوە بۆ سوننەت.

**٨٧** - وە عامر بن عبداللە وتی : پیاو بیدعەیەکی دانەهێناوە؛ ئیللا سبەینێ بەوەوە دێت کە ئەمڕۆ ئینکاری لێدەکرد .

**٨٨** - وە ابن عون وتی : ئەگەر ئارەزوو زاڵ بوو بەسەر دڵدا، ئەوا پیاو ئەوە بە چاك دەزانێت کە پێشتر لای ناشرین بوو .

**٨٩** - وە الفضیل وتی : بەردەوام بەندە داپۆشراوە - واتە عەیبەکانی - , هەتاکو ئەو کاتەی کە ناشرینییەکانی بە باش دەبینێ .

**٩٠** - وە ابو العالیة وتی : دوو ئایەت لە کتێبی اللە هەیە کە چەندە توندن لەسەر ئەو کەسانەی موجادەلە دەکەن لە بارەی قورئانەوە : ﴿مَا يُجَادِلُ فِي آيَاتِ اللَّهِ إِلَّا الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ [غافر : ٤]، ﴿وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُواْ فِى ٱلْكِتَٰبِ لَفِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ﴾ [البقرة : ١٧٦] .

**٩١** - وە ارطاة بن المنذر وتی : ئەگەر کوڕەکەم فاسقێك بێت لە فاسقەکان، ئەوا پێم خۆشترە لەوەی کە خاوەن هەوا و ئارەزوو بێت .

**٩٢** - وە ابو اسحاق الفزاري وتی : ئەگەر دانیشم لەگەڵ گاورەکان لە کەنیسەکانیاندا، پێم خۆشترە لەوەی کە لە حەلقەیەك دانیشم کە خەڵکی تێیدا مشتومڕ لەبارەی دینەکەیانەوە دەکەن .

---

: مەبەست لەم وتەیە بە جائیز دانانی دانیشتن نییە لە ناو کەنیسەدا، بەڵکو مەبەستی لە خراپی مشتومڕە لە بارەی دینەوە .

**٩٣** - وه سعيد بن جبير وتی : ئەگەر کوڕەکەم هاوڕێیەتی فاسقێکی پیسی سوننی بکات، پێم خۆشترە لەوەی کە هاوڕێیەتی عابدێکی موبتەدع بکات .

**٩٤** - وه بە مالك بن مغول وترا : کوڕەکەتمان بینی یاری بە باڵندەکان دەکرد!

وتی : چاکە، ئەگەر سەرقاڵی کردبێت لە هاوڕێیەتی کردنی موبتەدع .

**٩٥** - وه ابن شوذب وتی : لە نیعمەتی الله بۆ سەر گەنج و ئەعجەمی ئەوەیە کە ئەگەر دەستیان کرد بەوەی ببنە خاوەن عبادەت، لەگەڵ خاوەن سوننەیەك ڕێك بکەون بۆ ئەوەی هانیان بدات لەسەر سوننەت؛ چونکە گەنج و ئەعجەمی لەوە وەردەگرن کە پێشیان کەوتووە .

**٩٦** - وه عمرو بن قیس الملائي وتی : ئەگەر گەنجت بینی سەرەتای پێگەیشتنی لەگەڵ ئەهلی سوننە و جەماعە بوو ئەوا ئومێدت پێی هەبێت، وە ئەگەر بینیت سەرەتای پێگەیشتنی لەگەڵ ئەهلی بیدەع بوو ئەوا لێی بێ ئومێد بە، چونکە گەنج لەسەر سەرەتای پێگەیشتنیەتی .

**٩٧** - وه عمرو بن قیس وتی : گەنج پێدەگات، جا ئەگەر دانیشتن لەگەڵ ئەهلی علم لە لای گەورە بوو ئەوا لەوانەیە سەلامەت بێت، وە ئەگەر مەیلی بۆ غەیری ئەوان چوو ئەوا لەوانەیە لە ناو بچێت .

**٩٨** - وه حماد بن زید وتی : یونس پێی وتم : ئەی حماد، من گەنج ببینم لە هەموو حاڵەتێکی خراپی و تاوانکاری، لە باش بوون و خێری ئەو بێ ئومێد نابم، هەتاوەکو نەیبینم هاوڕێیەتی خاوەن بیدعە دەکات؛ جا ئەو کات دەزانم کە تیاچووە .

**٩٩** - الحسن وتی : بەندایەتی خاوەن بیدعە زیادی نەکردووە، ئیللا زیاتر لە اللە دوور کەوتۆتەوە .

**١٠٠** - وە ابن عون وتی : تێکۆشەر لە عیبادەتدا کە ئارەزووی لەگەڵ بێت، ئەوا تێکۆشانەکەی دەیبەستێتەوە بە سزای ڕۆژی دوایی .

**١٠١** - وە الأوزاعي وتی : ابلیس بە دۆستەکانی وت : لە کوێوە بۆ نەوەکانی ئادەم دەچن؟

وتیان : لە هەموو شوێنێکەوە بۆیان دەچین .

وتی : ئایا لە ڕێی داوای لێخۆشبوونیانەوە بۆیان دەچن؟

وتیان : ئەوە شتێکە کە ئێمە توانای کردنیمان نییە، چونکە ئەوان جێگیرن لەسەر تەوحید .

وتی : لە دەرگایەکەوە بۆیان دەچم کە لەوەدا داوای لێخۆشبوون لە اللە نەکەن.

الأوزاعي وتی : جا بیدعە و ئارەزووەکانی تێیاندا بڵاو کردەوە .

---

: بیدعە بە جۆرێکە کە بەندە تەوبەی لێ ناکات، چونکە بە حسابی خۆی کارێکی باشی کردووە، ئێ لە کاری باشیش تەوبە ناکرێ، ئەمەش یەکێکە لەو هۆکارانەی کە سەلەف لەسەر بیدعە و ئەهلەکەی توند بوونە، واللە اعلم .

**١٠٢** - وه سعيد بن عنبسة وتی : پیاو بیدعەیەکی دانەهێناوە ئیللا سینەی تووند بووە بەرامبەر موسڵمانان، وە ئەمانەتیشی لێسەندراوەتەوە .

**١٠٣** - وه الأوزاعي وتی : پیاو بیدعەیەکی دانەهێناوە؛ ئیللا وەرعی لێسەندراوەتەوە.

**١٠٤** - وه الحسن وتی : پیاو بیدعەیەکی دانەهێناوە؛ ئیللا ئیمان لێی بەری بووە .

---

: ئەم وتەیەی **الحسن** مەبەستی تکفیر نییە، بەڵکو هەر وەکو ئەو فەرموودەیەیە کە دەفەرموێ دز و زیناکار و عەرەق خۆر لەو کاتەدا ئیمانیان لێ جیادەبێتەوە، تاوانی بیدعەش لە زینا و دزی و عەرەق خواردنەوە گەورەترە، جا ئەگەر لە کاتی زینا و دزی و عەرەق خواردنەوەدا ئیمان لە جەستە لا بچێ ئەوا ئەولاترە لە کاتی بیدعەکردنیش لابچێت، والله اعلم .

**١٠٥** - وه ابن عون وتی : پیاو بیدعەیەکی دانەهێناوە؛ ئیللا الله شەرمی لێ سەندووەتەوە، وە توندییەتی خستۆتە جێی .

**١٠٦** - وه عثمان بن حاضر الأزدي وتی : چوومە ژوورەوە بۆ لای ابن عباس رضي الله عنهما، وتم : ئامۆژگاریم بکە. فەرمووی : ئیستیقامەت هەبێت، وە شوێن بکەوە و داهێنان مەکە .

**١٠٧** - وە ابن مسعود رضي الله عنە فەرمووی : شوێن بکەون و داهێنان مەکەن بەڕاستی بەستانە، چونکە هەموو داهێنراوێك بیدعەیە، وە هەموو بیدعەیەك گومڕاییە.

**١٠٨** - وە طلحة بن مصرف وتی : هەموو ئەوە باس مەکە کە بیستت، ئیللا ئەوە نەبێ کە ئەوەی بۆی باسکردووی لەسەر سوننە بێت .

**١٠٩** - وە ابو ادريس الخولاني وتی : ئەگەر ببینم لە مزگەوتدا ئاگرێك گەشە دەکات، پێم خۆشترە لەوەی بیدعەیەکی تیا ببینم کە ناگۆڕێت .

**١١٠** - وە عطاء وتی : خەریکە الله ئیزن بە خاوەن بیدعە نەدات بۆ تەوبە کردن .

**١١١** - وە ابن عباس رضي الله عنهما فەرمووی : هەر کەسێك دانی نا بە ناوێك لەم ناوە داهێنراوانە؛ ئەوا پەتی ئیسلامی لە ملی کردۆتەوە .

**١١٢** - وە ميمون بن مهران وتی : ئاگاداری هەر ناوێك بن کە ناوی غەیری ئیسلامی لێ دەنرێت .

**١١٣** - وە مالك بن انس وتی : هیچ شتێك لەم ئارەزووانە نەبووە نە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ ، وە نە ابو بكر، وە نە عمر، وە نە عثمان .

**١١٤** - وە مالك بن مغول وتی : ئەگەر پیاو ناو بنرێت بە غەیری ئیسلام و سوننەت، ئەوا بیخەرە پاڵ هەر دینێك کە خۆت دەتەوێ .

**١١٥** - وه عطاء وتی : لەوەی کە اللّٰه تبارك و تعالی بۆ سەر موسى عليه السلام دایبەزاند، تێیدا بوو دەیفەرموو : لەگەڵ ئەهلی ئارەزووەکاندا دامەنیشە، چونکە ئەوە لە دڵتدا دادەنێن کە پێشتر تێیدا نەبووە .

**١١٦** - وه ابو قلابة وتی : هیچ قەومێك بیدعەیەکیان دانەهێناوە؛ ئیللا شمشێریان تێیدا حەڵاڵ کردووە .

---

: واتە کوشتنی ئەوانەیان لا حەڵاڵ بووە کە بیدعەکەی ئەوانیان قبوڵ نەبووە، واللّٰه وعلم .

**١١٧** - وه ابو قلابة دەبارەی ئایەتی : ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ ٱلْعِجْلَ سَيَنَالُهُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَذِلَّةٌ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلْمُفْتَرِينَ﴾ [الأعراف : ١٥٢] .

وتی : وه ئەمە پاداشتی هەموو بوختان چییەکە هەتاکو ڕۆژی قیامەت .

**١١٨** - وه ابو قلابة وتی : ئەهلی ئارەزووەکان ئەهلی گومڕایین، من چارەنوسیان نابینم ئیللا بەرەو ئاگر نەبێ، تاقییان بکەنەوە هیچ کەسێکیان بە بێ شمشێر بانگەشەی بۆچوونێك یان وتەیەك ناکات کە نەهی بکات، وه دووڕوویی چەند جۆرێکە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿وَمِنْهُمْ مَنْ عَاهَدَ اللَّهَ﴾ [التوبة : ٧٥]، ﴿وَمِنْهُمْ مَنْ يَلْمِزُكَ فِي الصَّدَقَاتِ﴾ [التوبة : ٥٨]، ﴿وَمِنْهُمُ الَّذِينَ يُؤْذُونَ النَّبِيَّ﴾ [التوبة : ٦١]، جا وتەکانیان - واتە وتەی دوڕووەکان - جیاوازی تێکەوت، بەڵام کۆدەنگ بوون لەسەر گومان و بەدرۆ خستنەوە .

وە ئەوانیش - واتە ئەهلی ئارەزووەکان - وتەکانیان جیاوازی تێکەوت بەڵام کۆدەنگ بوون لەسەر شمشێر، وە چارەنوسیان نابینم ئیللا بەرەو ئاگر نەبێت .

**١١٩** - وە ابن عباس رضي الله عنهما فەرمووی : هەر کەسێك بستێك لە جەماعەت جیابۆوە، ئەوا پەتی ئیسلامی لە ملی کردۆتەوە .

**١٢٠** - وە محمد بن الحنفية وتی : قیامەت بەرپا نابێت هەتاوەکو مشتومڕ و ناکۆکی خەڵکی دەربارەی پەروەردگاریان نەبێت .

**١٢١** - وە عبدالله بن عمرو رضي الله عنهما فەرمووی : نزیکە ئەو شەیتانانە دەربکەون کە سليمان بن داود عليهما السلام دەستگیری کردبوون و خەڵکی تووشی فیتنە بکەن .

**١٢٢** - وە ايوب السختياني وتی : ابو قلابة پێی وتم : ئەی ایوب، چوار شت لە منەوە لەبەر بکە :

**أ** - بە بۆچوونی خۆت دەربارەی قورئان قسە مەکە .

**ب** - وە ئاگاداری قەدەر بە - واتە موجادەلەی تێدا مەکە، والله اعلم - .

**ج** - وە ئەگەر باسی هاوەڵانی رسول الله ﷺ کرا دەستی پێوە بگرە .

**د** - وە ڕێگە مەدە بە خاوەن ئارەزووەکان کە گوێت لێیان بێت، چونکە هەر چییەکیان بوێت دەیگەیەنن بە گوێت .

**١٢٣** - وه‌ ابراهيم النخعي سه‌باره‌ت به‌ فه‌رمايشتى الله عز و جل : ﴿وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ﴾ [المائدة : ٦٤]، وتى : ئه‌وانه‌ ئه‌هلى ئاره‌زووه‌كانن .

**١٢٤** - وه‌ معاوية بن قرة وتى : مشتومڕ و ناكۆكى له‌ ديندا كرده‌وه‌كان به‌تاڵ ده‌كه‌نه‌وه‌ .

**١٢٥** - وه‌ يوسف بن اسباط وتى : ڕوانين بۆ خاوه‌ن بيدعه‌؛ ڕووناكى حه‌ق له‌ دڵدا ده‌كوژێنێته‌وه‌ .

**١٢٦** - وه‌ بشر بن الحارث وتى : ئه‌گه‌ر ڕێگاكه‌ت له‌سه‌ر ڕێگاى خاوه‌ن بيدعه‌يه‌ك بوو؛ ئه‌وا چاوت داخه‌ پێش ئه‌وه‌ى بگه‌يت پێى .

**١٢٧** - وه‌ ابو العباس الخطاب وتى : ئه‌گه‌ر له‌ ماڵه‌كه‌ت ده‌رچوويت، پاشان خاوه‌ن بيدعه‌يه‌ك گه‌يشت پێت ئه‌وا بگه‌ڕێره‌وه‌، چونكه‌ شه‌يتانه‌كان چوارده‌وريان داوه‌ .

**١٢٨** - وه‌ مسلم بن يسار وتى : ئاگادراى موجاده‌له‌ بن، چونكه‌ ئه‌وه‌ كاتى نه‌زان بوونى زانايه‌، وه‌ شه‌يتان له‌و كاته‌دا ده‌يه‌وێت ده‌ستى بوه‌شێنێت .

**١٢٩** - وه‌ الحسن وتى : خاوه‌ن بيدعه‌ نه‌ ڕۆژووى لێ وه‌رده‌گيرێ، نه‌ نوێژ، نه‌ حه‌ج، نه‌ عومره‌، نه‌ صه‌ده‌قه‌، نه‌ جيهاد، وه‌ نه‌ فه‌رز، و نه‌ نافيله‌ .

**١٣٠** - وه‌ الزهري وتى : پشت به‌ستن به‌ سوننه‌ت ڕزگار بوونه‌، وه‌ زانست له‌ناوده‌چێ به‌ له‌ناوچوونێكى خێرا، جا ژيانه‌وه‌ى زانست بريتييه‌ له‌ : جێگيرى دين و دونيا، وه‌ نه‌مانى هه‌موو ئه‌مانه‌ : نه‌مانى زانايانه‌ .

**١٣١** - وە عمر بن عبدالعزيز وتی : هەر کەس دینەکەی کردە ئامانجێك بۆ مشتومڕ و ناکۆکی؛ ئەوا زۆر دەگوازێتەوە - واتە زوو زوو عەقیدەی دەگۆڕێت - .

**١٣٢** - وە محمد بن علي وتی : لەگەڵ هاوەڵانی مشتومڕ و ناکۆکیدا دامەنیشن؛ چونکە ئەوان ڕۆدەچن لە ئایەتەکانی الله دا و خراپ دەدوێن لە بارەیانەوە .

**١٣٣** - وە غضیف بن الحارث وتی : بیدعەیەك دەرناکەوێت ئیللا سوننەتێکی هاوشێوەی ئەو وازی لێ دەهێنرێ .

**١٣٤** - وە ابن سیرین وتی : هەر کات پیاو لەسەر ئەثەر بوو ئەوا لەسەر ڕێگاکەیە.

**١٣٥** - وە ابراهیم النخعي وتی : ئەگەر پێم بگات لەوانەوە واتە لە هاوەڵانەوە کە دەستنوێژەکەیان لە شوشتنی نینۆکیان تێنەپەڕیوە ئەوا منیش تێم نەدەپەڕاند، وە بەسە بۆ قەومێك کە بکەونە گوناهەوە ئەگەر سەرپێچی کردەوەکانی ئەوان بکەن .

**١٣٦** - وە شریح وتی : من بەڕاستی شوێنی ئەثەر دەکەوم؛ جا هەر کەسم لەوانەی پێش خۆم بینی چیان کردووە ئەوا بۆتان باس دەکەم .

**١٣٧** - وە بەشێك لە زانایان وتیان : پێش اعتزال لە دایك بووم - واتە بیدعەی موعتەزیلە - .

**١٣٨** - وە الشعبي وتی : من هەبووم و لە دونیادا رفض بوونی نەبوو - واتە بیدعەی ڕافیزەکان - .

**١٣٩** - وه باسی قەدەر - واتە بیدعەی قەدەریەکان - لەلای مجاهد کرا؛ وتی : کافر بوومە بە دینێك کە من لە پێش ئەوەوە لە دایك بوومە .

**١٤٠** - وە مالك بن انس وتی : بە پیاوێك وترا کە لە سەرەمەرگدا بوو : لەسەر چ دینێك دەمریت؟

وتی : لەسەر دینی أبي عمارة . کە پیاوێك بوو هەندێك لە ئەهلی ئارەزوو هاوەڵێتیان دەکرد .

وتی : جا مالك رحمه الله وتی : واز لە دینی ابو القاسم ﷺ دەهێنێ، وە لەسەر دینی ابو عمارة دەمرێت!

**١٤١** - ابن عباس رضي الله عنهما فەرمووی : معاوية رحمة الله عليه پێی وتم : تۆ لەسەر دینی علي یت رحمة الله علیه؟

وتم : نەخێر، وە لەسەر دینی عثمان یش نیم، من لەسەر دینی رسول الله م ﷺ .

**١٤٢** - وە ابن عباس رضي الله عنهما فەرمووی : دوو پیاو کۆنەبوونەتەوە مشتومڕ و ناکۆکی بکەن لە دین، کە جیابونەوە درۆ لەسەر الله عز و جل هەڵ دەبەستن .

**١٤٣** - وە ابراهیم النخعي وتی : هەرگیز مشتومڕ و ناکۆکیم نەکردووە .

**١٤٤** - وە معاذ وتی : دەستی الله لەسەر جەماعەتە؛ وە هەر کەس خۆی شاز کرد الله باکی بە شاز بوونەکەی نییە .

**١٤٥** - وە مصعب وتی : لەگەڵ کەسێکی توشبوو بە فیتنە دامەنیشە چونکە لە پێکانی یەکێك لەم دوانە هەڵە ناکات :

یان ئەوەتا تووشی فیتنەت دەکات و شوێنی دەکەویت، یان ئازارت دەدات پێش ئەوەی بڕوات .

**١٤٦** - وە علي رضي الله عنه فەرمووی : هەر کەس لە جەماعەت جیابۆوە؛ ئەوا پەتی ئیسلامی لە ملی کردۆتەوە .

**١٤٧** - وە ابو الزبیر وتی : لەگەڵ طاووس چوینە ژورەوە بۆ لای ابن عباس، طاووس پێی وت : ئەی باوکی عباس، چی دەڵێی دەربارەی ئەوانەی قەدەر ڕەت دەکەنەوە؟

فەرمووی : هەندێکیانم نیشان بدە؟ - ابن عباس ئەو کاتە نابینا بووبوو - .

وتمان : چی دەکەیت؟

فەرمووی : ئەگەر دەستم ببەمە لای سەری، ئەوا ملی دەگوشم هەتاوەکو دەیکوژم .

**١٤٨** - وە ابن عباس رضي الله عنه فەرمووی : هەر کەس لە جەماعەت جیابۆوە و پاشان مرد؛ ئەوا مردووە بە مردنێکی جاهیلیانە .

**١٤٩** - وە مجاهد دەربارەی فەرمایشتی الله عز و جل : ﴿ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا﴾ [الأنعام : ٦٨]، وتی : ئایەتەکانمان بە درۆ دەخەنەوە .

**١٥٠** - وه الحسن وتی : سوێند به الله، الله هیچ کردەوەیەك لەوانەی کە لە الله پێی نزیك دەبیتەوە لە موبتەدعی وەرناگرێ؛ نە نوێژ؛ نە ڕۆژوو؛ نە زەکات؛ نە حەج؛ نە جیهاد؛ نە عومرە؛ و نە صدەقە. هەتا چەند کردەوەیەکی چاکەی تریشی باس کرد.

پاشان وتی : بە ڕاستی نمونەی هەر یەکێکیان وەکو کەسێکە بیەوێ بەرەو ئەملا سەفەر بکات، بەڵام بەرەو ئەولا دەڕوا، جا ئایا جگە لە دووربونەوە هیچ زیاد دەکات بەرەو ئەو لایەی کە دەیویست سەفەری بۆ بکا؟ موبتەدعیش ئاوایە جگە لە دووری هیچ شتێك زیاد ناکا بەو کردەوانەی کە لە الله پێی نزیك دەبیتەوە .

**١٥١** - وە مرة الطیب لەبارەی فەرمایشتی الله تعالى : ﴿وَأَفْئِدَتُهُمْ هَوَاءٌ﴾ [إبراهيم : ٤٣]، وتی : دوورن لە ڕاستیەوە و هیچ شتێك تێ ناگەن .

**١٥٢** - وە ابو حمزة وتی : پرسیارم لە ابراهیم کرد لەبارەی ئەم ئارەزووانەوە بە کامیان زیاتر سەرسامیت؟ چونکە من دەمەوێت بە ڕای تۆ وەرگرم .

وتی : الله لە هیچ شتێك لەوان مسقاڵە زەڕڕەیەك خێری دانەناوە، وە ئەوان هیچ نین جگە لە ڕازاندنەوەی شەیتان، جا کارەکە هەر کاروباری سەرەتایە .

**١٥٣** - وە ابو العالية وتی : دوو نیعمەتی الله بەسەرمەوەیە نازانم کامیان باشترە یان وتی گەورەترە؛ کە هیدایەتی دام بۆ ئیسلام، وە ئەوەی تریان : کە پاراستمی لە رافضة، و الحرورية، و المرجئة، و القدرية، و ئارەزووەکان .

**١٥٤** - وە الحسن بن شقيق وتی : لای ابن مبارك بووین کاتێك پیاوێك هات بۆ لای، - ابن مبارك - پێی وت : تۆ ئەو جەهمیە نیت؟

وتی : بەڵێ .

وتی : ئەگەر ڕۆیشتی نەگەڕێیتەوە بۆ لام .

پیاوەکە وتی : من تەوبەم کردووە .

وتی : نەخێر، هەتاکو ئەو کاتەی کە تەوبەکەت دەردەکەوێت بە ئەندازەی ئەوەی کە بیدعەکەت دەرکەوتبوو .

**١٥٥** - بقية بن وليد وتی : ثابت بن عجلان پێی وتم : گەیشتم بە انس بن مالك، و سعيد بن المسيب، و عامر الشعبي، و ابراهيم النخعي، و سعيد بن جبير، و الحكم بن عتيبة، و حماد بن ابي سليمان، و عطاء، و طاووس، و مجاهد، و ابن ابي مليكة، و مكحول، و سليمان بن موسى، و الحسن، و ابن سيرين، و ابو عمار. كە ابو عمار گەیشتووە بە ابو بكر الصديق وە غەیری ئەوانەی کە ناوم هێنان؛ هەموویان فەرمانیان پێدەکردم بە نوێژی جەماعەت، وە نەهییان لێدەکردم لە بیدعە و ئارەزووەکان، هەتاکو وتی : پێی وتم : ئەی باوکی محمد، والله هیچ شتێك لە ناخمدا پتەوتر نییە لە هاتنم بۆ ئەم مزگەوتە، وە لەوانەیە کە کاربەدەستێکی لەسەر بێ هەر وەکو ئەوە بێ کە الله بیەوێ کە زانیومانە و بینیویشمانە، واز لە نوێژکردن ناهێنین لە پشتیەوە .

**١٥٦** - وە ابن وهب وتی : پرسیار کرا لە مالك دەربارەی ئەهلی قەدەر : ئایا وازبهێنێت لە قسەکردن و مشتومڕ لەگەڵیان باشترە؟

وتی : بەڵێ، ئەگەر دەیزانی کە لەسەر چییە - واتە ئەگەر قەدەریەکە زانی لەسەر چییە -.

وتی : وە فەرمانی بە چاکە پێدەکەی، وە نەهی لێ دەکەی لە خراپە، وە جیاواز لەمەیان پێدەڵێی، کە بابەت نەکەنەوە بۆ مناقەشە، و نوێژ لە پشتیانەوە نەکەن .

مالك وتی : وە من وای نابینم نیکاحیشیان لەگەڵدا بکرێت .

**١٥٧** - وە مالك پرسیاری لێکرا دەربارەی هاوسەرگیری لەگەڵ قەدەریدا .

وتی : ﴿وَلَعَبْدٌ مُؤْمِنٌ خَيْرٌ مِنْ مُشْرِكٍ﴾ [البقرة : ٢٢١] .

**١٥٨** - وتی : وە بیستم مالك دەیوت : ئەو پیاوە ئەگەر هەندێك لەوانەی هاوەڵانی ئارەزوو بهاتنایە بۆ لای، دەیوت : من لەسەر بەرچاوڕوونیم ل پەروەردگارمەوە، بەڵام تۆ بە گومانیت جا بچۆ بۆ لای بە گومانێکی وەکو خۆت مشتومڕی لەگەڵ بکە .

وتی : وە مالك وتی : چەواشەی خۆیان دەکەن، و بەدوای کەسێکیشدا دەگەڕێن فێریان بکات .

**١٥٩** - وە مالك وتی : پیاوێك وتی : هاتمە ناو هەموو ئەم دینانەوە؛ کەچی هیچ شتێکی ڕاستم لێیان نەبینیی .

پیاوێکیش لە قسەزانەکانی مەدینە وتی : من پێت دەڵێم بۆ ئاوایە .

وتی : پێم وت : لەبەر ئەوەی کە تەقوای الله ناکەیت، خۆ ئەگەر تەقوای الله ت بکردایە، ئەوا دەروویەکی بۆ ئەم کارەت لێدەکردیتەوە .

**١٦٠** - وە ابو سهیل ی مامی مالك بن انس وتی : عمر بن عبدالعزیز ڕاوێژی پێ کردم سەبارەت بە قەدەرییەکان .

وتم : ڕام وایە تەوبەیان پێ بکەیت، جا ئەگەر تەوبەیان کرد باشە ئەگەر نا بە شمشێر لێیان دە .

عمر بن عبدالعزیز وتی : ئەوە ڕای منیشە .

وە بە هەمان شێوە مالك بن انس و الحسن بۆچوونیان وابوو دەربارەیان .

**١٦١** - وە الحسن بن محمد بن علي ڕای وانەبوو کە موسڵمان بن - واتە قەدەرییەکان -, وە خەواریجەکانیش .

: قەدەرییەکان و خەواریجەکان بە ڕەهایی تەکفیر نەکراون، لە قەدەرییەکاندا ئەوانە کافرن کە نکۆڵی لە علمی الله دەکەن، لە خەواریجەکانیش ئەوانە کافرن کە ماوەڵانی وەک عثمان و علي تەکفیر ئەکەن چونکە ئەوان مژدەی بەهەشتیان پێدراوە، والله اعلم.

**١٦٢** - وە ابن المبارك وتی : هەر کەس بە کەلامەوە سەرقاڵ بوو ئەوا زندیق دەبێت.

: کەلام واتە ئەو بەناو عیلمەی کە جەهمی و موعتەزیلی و کوللابی و ئەشعەری و ماتوریدیە کافرەکان عەقیدەی خۆیانیان لەسەر دامەزراندووە، وە قورئان و سوننەت ئەدەن لە فیلتەری بەناو عیلمی کەلام بۆیە کەوتوونەتەوە ناو ئەو هەموو کوفرەوە لە بابەتی ناو و سیفاتەکانی الله عز وجل، وە زندیق واتە منافق کە ئیسلام دەردەخات و کوفر دەشارێتەوە، والله اعلم .

**١٦٣** - وه ابن المبارك وتی : الله چەند مەلائیکەتێکی هەیە کە بە دوای مەجلیسی زیکردا دەگەڕێن، بۆیە تەماشا بکە مەجلیست لەگەڵ کێدایە، با لەگەڵ خاوەن بیدعەیەك نەبێت؛ چونکە الله تەماشایان ناکات؛ وە نیشانەی دووڕوویش ئەوەیە : کە پیاو لەگەڵ موبتەدیعێك هەڵسێت و دانیشێت .

**١٦٤** - وه محمد بن النضر الحارثي وتی : هەر کەسێك گوێی شل بکات بۆ خاوەن بیدعەیەك؛ ئەوا پارێزراویی لێ دەسەنرێتەوە، و دەدرێتە دەست نەفسی خۆی .

**١٦٥** - وه الفضيل بن عياض وتی : گەیشتم بە باشترینی خەڵکی کە هەموویان هاوەڵی سوننە بوون، نەهییان لە خاوەن بیدعەکان دەکرد، جا خاوەن سوننەت ئەگەر چی کردەوەشی کەم بێت من تکام بۆی هەیە، بەڵام الله کردەوەی خاوەن بیدعە بەرز ناکاتەوە ئەگەر چی زۆریش بێت .

**١٦٦** - وه عبدالله بن عمر السرخسي کە هاوەڵی ابن المبارك بوو، وتی : لای خاوەن بیدعەیەك نانێکم خوارد، پاشان گەیشتەوە بە ابن المبارك .

وتی : سی ڕۆژ قسەت لەگەڵ ناکەم .

**١٦٧** - وه اسماعيل الطوسي وتی : ابن المبارك پێی وتم : با مەجلیست لەگەڵ هەژاران بێت؛ وە نەکەی مەجلیست لەگەڵ خاوەن بیدعەیەك بێت، چونکە من لە تووڕەیی الله عز و جل دەترسم بەسەرتەوە .

**١٦٨** - وه الفضيل بن عياض وتی : نەکەی مەجلیست لەگەڵ خاوەن بیدعەیەك بێت، چونکە من لە تووڕەیی الله عز و جل دەترسم بەسەرتەوە .

**١٦٩** - وه منصور بن المعتمر وتی : الله عز و جل ئادەمی علیه السلام نارد به شەریعەتەوە، جا خەڵکی لەسەر شەریعەتی ئادەم بوون هەتا زندیقیەت دەرکەوت، بۆیە شەریعەتی ئادەم نەما، پاشان الله عز و جل نوحی علیه السلام نارد به شەریعەتەوە، جا خەڵکی لەسەر شەریعەتی نوح بوون، وە هیچ شتێکیش نەبووە هۆی نەمانی جگە لە زندیقیەت، پاشان الله ابراهیمی نارد علیه السلام، خەڵکی لەسەر شەریعەتی ابراهیم بوون هەتاکو زندیقیەت دەرکەوت، بۆیە شەریعەتی ابراهیم علیه السلام نەما، پاشان الله عز و جل موسای نارد علیه السلام، خەڵکی لەسەر شەریعەتی موسا بوون هەتاکو زندیقیەت دەرکەوت، وە شەریعەتی موسا نەما، پاشان الله عز و جل عیسای نارد علیه السلام، خەڵکی لەسر شەریعەتی عیسا بوون هەتاکو زندیقیەت دەرکەوت، جا شەریعەتی عیسا نەما، پاشان الله عز و جل محمدی نارد ﷺ به شەریعەتەوە، وە ترس نییە دەربارەی نەمانی ئەم دینە ئیللا بە زندیقیەت نەبێت .

**١٧٠** - وه محمد بن علي وتی : بە گوێی سەرکردەکانی دونیا مەکەن - لە سەرپێچی الله دا - ، چونکە الله دین لە دڵتاندا ناهێڵێت .

**١٧١** - وه الشعبي وتی : ئەگەر خەڵکی بە گوێی دەسەڵاتدارانیان کرد لەو بیدعەیەی کە بۆی داهێناون، ئەوا الله ئیمان لە دڵیاندا دەردەهێنێت، و ترس دەخاتە شوێنی .

**١٧٢** - وه الحسن وتی : کاربەدەستانێك دێن کە بانگەشەی خەڵکی دەکەن بۆ سەرپێچی کردنی سوننەت؛ جا خەڵکەکەی ژێر دەستیان بە گوێیان دەکەن لە ترسی

نەمانی دونیاکەیان، لەو کاتەدا الله ئیمان لە دڵیان دەسەنێتەوە، و هەژاریيان بۆ جێدەهێڵێ، وە ئارامیان لەسەر هەڵدەگرێ، و پاداشتیشیان ناداتەوە لەسەری .

**١٧٣** - وە یونس بن عبید وتی : ئەگەر دەسەڵاتدار سەرپێچی سوننەتی کرد، وە خەڵکەکەی ژێر دەستی وتیان : فەرمانمان بە گوێڕایەڵی پێکراوە؛ ئەوا الله گومان لە دڵەکانیاندا دادەنێت، وە تانە و توانجیان بۆ جێدەهێڵێ .

**١٧٤** - وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (دینی پیاو لەسەر دینی دۆستەکەیەتی، جا با هەر یەکێکتان تەماشا بکات دۆستایەتی کێ دەکات) .

**١٧٥** - وە سلیمان بن داود علیهما السلام فەرمووی : بڕیار لەسەر کەس مەدەن بە هیچ شتێك مەتاکو دەبینن کە هاوڕێیەتی کێ دەکات .

**١٧٦** - وە الله عز و جل وەحی بۆ موسی علیه السلام نارد : ئەی موسی بەئاگا بە، وە برایانێك بۆ خۆت هەڵبژێرە، وە هەر هاوڕێیەك ناتهێنێت بۆ ڕێگای من ئەوا لێی ئاگادار بە؛ چونکە ئەوە دوژمنتە، وە من لێی بەریم .

**١٧٧** - وە ابن المبارك وتی : هەر کەس بیدعەکەی لێمان شاردەوە، ئەوا خۆ دۆستەکانی لێمان نەشاردۆتەوە .

**١٧٨** - وە وتراوە : مەجوسییەکان دین و کتێبیان هەبوو، وە پاشایەك لەوان کەوتە داوی خوشکەکەیەوە، وە حەزی لێی کردبوو، جا لە قەومەکەی ژێر دەستی ترسا، بۆیە وتی : ئەوەی کە من کردم حەڵاڵە .

وه دەیکوشتن لەسەری - واتە ئەوانەی دەکوشت کە بە حەڵاڵیان نەدەزانی - , جا زاڵ بوو بە سەریاندا هەتاکو لە ناو مەجوسدا هاوسەرگیری کردن لەگەڵ خوشکان و دایکانیان مایەوە، وە شەریعەتی یەکەمیان پووچەڵ بۆوە .

**١٧٩** - وە الحسن وتی : بەردەوام دین بەهێزە هەتاوەکو ئەو کاتەی دەسەڵاتدار ئارەزووی تێ نەکەوتوە، ئەوان دینداری بە خەڵکی دەکەن، جا ئەگەر ئەوانیش ئارەزوویان تێکەوت کێ دینداریان پێ بکا؟!

**١٨٠** - وە ابن مسعود رضي الله عنه فەرمووی : ئەگەر خەڵکی کەوتنە ناو خراپەوە؛ بڵێ : من هیچ سەرمەشقێکم نییە لە خراپەدا، پیاو دەبێ نەفسی خۆی ڕابێنێ لەسەر ئەوەی ئەگەر هەموو خەڵکی کوفر بکەن ئەم نەیکات .

**١٨١** - وە عمر بن الخطاب رضي الله عنه بە سوید بن غفلة ی فەرموو : لەوانەیە تۆ لە دوای من بمێنیت؛ جا گوێڕایەڵی پێشەوا بکە، تەنانەت ئەگەر کۆیلەیەکی لوت و لێو و گوێ قرتاو بوو : ئەگەر ستەمی لێ کردیت ئارام بگرە، وە ئەگەر بێبەشی کردیت ئارام بگرە، وە ئەگەر تۆی ویست بۆ کارێك کە دینەکەت هەڵدەوەشێنێتەوە، ئەوا بڵێ : خوێنم لە پێناو دینەکەمدایە .

**١٨٢** - وە مطرف بن عبدالله وتی : هەر کەسێك دینەکەی بکاتە قوربانی سامانەکەی، ئەوا الله هەژاری بۆ جێدەهێڵێ، وە ڕۆژی قیامەت حەشری دەکات لەگەڵ ئەوانەی کە ئاڵاکە هەڵدەگرن لەبەردەم ئیبلیسدا بۆ جەهەننەم .

**١٨٣** - وە الفضیل بن عیاض وتی : بەهێزترین پەتی ئیسلام بریتیە لە : خۆشەویستی لە پێناو الله، وە ڕق و کینە لە پێناو الله .

**١٨٤** - وه الفضيل وتى : خاوەن بيدعه : له دينەكەتدا لێى ئەمين مەبه، وه له كاروبارتدا ڕاوێژى پێ مەكه، وه لاى دامەنيشه؛ چونكه هەر كەس لاى خاوەن بيدعەيەك دانيشت الله كوێرى بۆ جێدەهێڵێ .

**١٨٥** - وه الفضيل وتى : سەيركردنى ئيماندار بۆ ئيماندار ڕووناكى دڵه، وه سەيركردنى پياو بۆ خاوەن بيدعه كوێرى بۆ جێدەهێڵێ واته بۆ دڵى .

**١٨٦** - وه الفضيل دەيوت : ژيانێكى خاوێن بگره بەر : ئيسلام و سوننەت .

**١٨٧** - وه مجاهد له بارەى فەرمايشتى الله عز و جل : ﴿فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً﴾ [النحل : ٩٧]، وتى : باشييەتى ڕا و بۆچوون واته : سوننەت .

**١٨٨** - وه الفضيل وتى : موبتەديع بۆنى بەهەشت ناكات .

**١٨٩** - وه الفضيل وتى : خۆشبەختى بۆ هەر كەسێك كه لەسەر ئيسلام سوننەت مردووه .

پاشان الفضيل گريا بۆ سەردەمێك كه بيدعه تێيدا دەردەكەوێت، جا ئەگەر ئەوه ڕوويدا؛ ئەوا زۆر بڵێن : ما شاء الله .

**١٩٠** - وه الفضيل وتى : هەر كەسێك لەگەڵ خاوەن بيدعەيەك دانيشت ئەوا حيكمەتى پێ نادرێت .

**١٩١** - وه الفضيل وتى : لەگەڵ خاوەن بيدعه دامەنيشه، چونكه من له لەعنەت دەترسم بەسەرتەوه .

**١٩٢** - وه الفضيل وتی : هەر كەسێك ڕێز له خاوەن بیدعه بگرێ و به گەوره ڕایگرێ؛ ئەوا یارمەتی داوه لەسەر ڕووخاندنی ئیسلام .

**١٩٣** - وه الفضيل وتی : الله چەند بەندەیەکی هەیه که وڵاتەکانی پێ زیندوو دەکاتەوە، که ئەوانیش ئەهلی سوننەن؛ هەر كەسێك لەوان بێت دەزانێ چی دەچێتە سکییەوە - واته به دوای خواردنی حەڵاڵ دەگەڕێ - ، وه هەر کەس ئاوا بوو ئەوا له حیزبی الله عز و جل ـه .

**١٩٤** - وه الفضيل وتی : هەر کەس شوێنی تەرمی موبتەدیعێك کەوت بەردەوام له ژێر توڕەیی الله ـدایه تا دەگەڕێتەوە .

**١٩٥** - وه سفيان بن عيينة به پیاوێکی وت : له کوێوه هاتووی؟

وتی : لای تەرمی فڵانی کوڕی فڵان .

وتی : فەرموودەت بۆ باس ناکەم؛ داوای لێخۆشبوون له الله تعالى بکه، وه نەگەڕێیتەوە، تەماشای پیاوێکت کردووه که ڕقی له هاوەڵانی رسول الله یه ﷺ؛ وه شوێنی جەنازەکەشی کەوتی!

**١٩٦** - وه هارون بن زياد وتی : گوێم له الفريابي بوو که پیاوێك پرسیاری لێکرد سەبارەت بەو کەسەی که جنێو به ابو بكر رضي الله عنه دەدات؟ وتی : کافره .

وتی : نوێژی لەسەر کەین؟

وتی : نەخێر .

جا لێم پرسی : چی لێ بکەین لە کاتێکدا ئەو دەڵێ : لا اله الا الله؟

وتی : دەستی لێ مەدەن، بەڵکو بە دارێك پاڵی پێوە بنێن تا دەیخەنە ئەو چاڵەی بۆتان هەڵکەندووە .

**١٩٧** - وە محمد بن بشار وتی : بە عبدالحمن بن مهدي م وت : ئامادەی تەرمی کەسێك بم کە جنێو بە هاوەڵانی رسول الله ﷺ دەدات؟

وتی : ئەگەر خزمی من بوایە میراتم لێی نەدەگرت .

**١٩٨** - وە ابو بکر بن عياش وتی : نوێژ ناکەم لەسەر رافضي و حروري؛ چونکە رافضي عمر بە کافر دەزانن، وە حروري - تاقمێکن لە خەواریج - علي بە کافر دەزانن .

**١٩٩** - وە طلحة بن مصرف وتی : رافضة نیکاح لەگەڵ ئافرەتەکانیان ناکرێ، وە سەربڕاویشیان ناخورێت، چونکە ئەوان ئەهلی هەڵگەڕانەوەن - واتە مورتەددن - .

**٢٠٠** - وە بە الحسن وترا : فلان کەس پیاوێکی شۆردووە لە ئەهلی ئارەزوو .

وتی : بیناسنەوە ئەگەر مرد ئێمە نوێژی لەسەر ناکەین .

**٢٠١** - وە ابن سيرين پیاوێك لە هاوڕێکانی بینی لە مەندێك لە دوکانەکانی بەصرەدا، پێی وت : ئەی فلان لێرە چی دەکەیت؟

وتی : سەردانی فلانم کرد کە نەخۆش بوو . واتە کەسێك لە ئەهلی ئارەزوو .

ابن سيرين پێی وت : ئەگەر نەخۆش کەوتیت سەردانت ناکەین، وە ئەگەر مردیت نوێژت لەسەر ناکەین؛ مەگەر تەوبە بکەیت . وتی : تەوبەم کرد، تەوبەم کرد .

**٢٠٢** - وه الفضيل وتى : خواردنى جولەكە و گاور دەخۆم، بەڵام خواردنى خاوەن بیدعە ناخۆم .

**٢٠٣** - وە دەیوت : یا الله وا نەكەیت كە خاوەن بیدعەیەك دەستى هاوكارى هەبێ لاى من؛ تا دواتر بە هۆى ئەوەوە خۆشم بوێت .

**٢٠٤** - وە الفضيل وتى : الله كە زانى پیاوێك ڕقى لە خاوەن بیدعەیەكە؛ ئومێدم وایە الله لێى خۆش بێت، ئەگەر چى كردەوەشى كەم بێت .

**٢٠٥** - وە المروذي وتى : پرسیارم لە باوكى عبدالله كرد - واتە امام احمد - دەربارەى كەسێك كە جنێوى دابێت بە ابو بكر، و عمر، و عثمان، و عائشة رضي الله عنهم؟

وتى : واى بۆ ناچم كە لەسەر ئیسلام بێت .

**٢٠٦** - وە مالك بن انس وتى : ئەو كەسەى كە جنێو دەدات بە هاوەڵانى رسول الله ﷺ هیچ سەهمێك، یان وتى : هیچ بەشێكى نییە لە ئیسلامدا .

**٢٠٧** - وە بشر بن الحارث وتى : هەر كەس جنێوى دا بە هاوەڵانى رسول الله ﷺ ئەوا كافرە، تەنانەت ئەگەر ڕۆژوو بگرێت، و نوێژ بكات، و لافى ئەوەش لێبدا كە لە موسڵمانانە .

**٢٠٨** - وە الأوزاعي وتى : هەر كەس جنێوى دا بە ابو بكر الصديق رضي الله عنه؛ ئەوا لە دینەكەى هەڵگەڕاوەتەوە، وە خوێنى حەڵاڵ بووە .

**٢٠٩** - وه ابو عبيد القاسم بن سلام وتى : هيچ بەشێك نييه بۆ رافضي نه له الفيء، و نه له غەنيمەت، لەبەر فەرمايشتى الله عز و جل : ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ [الحشر : ١٠] .

: الفيء واته ئەو دەستكەوتەی كه بەبێ جەنگ دەستی موسڵمانان دەكەوێ، بەڵام به پێچەوانەوه غەنيمەت ئەوەيه كه له دوای جەنگ دەستيان دەكەوێ، وه بەڵگەی بەم ئايەته هێناوەتەوه؛ والله اعلم، چونكه لەم ئايەته باسی ئەو ئيماندارانه دەكا كه له دوای هاوەڵان دێن و دوعا بۆ خۆيان و هاوەڵانيش دەكەن، جا ئاشكرايه كه رافضة واته شيعه به زۆربەيان دەڵێن كافر و تەنيا كەمێكيان به موسڵمان دەزانن.

**٢١٠** - وه حماد بن زيد وتی : لای ايوب، و يونس بن عبيد، و ابن عون بووم، جا عمرو بن عبيد بەلاياندا تێپەڕی و سەلامی لێيان كرد، و لايان وەستا، ئەوانيش وەڵاميان نەدايەوه، پاشان ڕۆيشت، ئەوانيش باسيان نەكرد .

:عمرو بن عبيد له سەرانی قەدەری و موعتەزيله بووه لعنه الله .

**٢١١** - وه الفضيل بن عياض وتی : دەستی الله لەسەر جەماعەته، وه الله سەيری خاوەن بيدعه ناكات .

**٢١٢** - وه زائدة وتى : به منصور م وت : ئه‌ى باوكى عتاب، ئه‌مڕۆ كه يه‌كێك له ئێمه به ڕۆژووه، كه‌م و كورتى له‌وانه بگرێ كه كه‌م و كورتى له ابو بكر و عمر رضي الله عنهما ده‌گرن؟ وتى : به‌ڵێ .

---

: واته خێرى ڕۆژووه‌كه‌ت كه‌م نابێته‌وه به‌و كاره، والله اعلم .

**٢١٣** - وه الحسن وتى : خاوه‌ن بيدعه‌كان غه‌يبه‌تيان بۆ نييه .

---

: واته ئه‌گه‌ر باسيان بكه‌ى به غه‌يبه‌ت بۆت نانوسرێ .

**٢١٤** - وه عطاء وتى : الله ئيزن به خاوه‌ن بيدعه نادات ته‌وبه بكات .

**٢١٥** - وه ابو عبيد وتى : تێكه‌ڵى خه‌ڵكى بووم، و قسه‌م له‌گه‌ڵ ئه‌هلى كه‌لام كرد، جا هيچ قه‌ومێكم نه‌دى پيستر، و قێزه‌ونتر بن، وه حوججه‌يان لاوازتر بێ، و گه‌مژه تر بن له رافضة .

**٢١٦** - وه باسى ئاره‌زووه‌كان له لاى رقبة بن مصقلة كرا، وتى :

ئه‌مما رافضة : بوختانيان كردووه به حوججه .

وه ئه‌مما مورجيئه : له‌سه‌ر دينى پاشاكانن .

وە ئەمما الزيدية : پێم وابێت ئەوەی کە بۆچوونەکەی بۆیان داناوە ئافرەت بووە.

وە ئەمما موعتەزیلە : واللە دەرنەچووم بۆ سەر کارەکەم، کە ویستومە بگەڕێمەوە ئیللا ئەوان لە بۆچوونەکەی خۆیان گەڕاونەتەوە .

**٢١٧** - وە طلحة بن المصرف وتی : ئەگەر دەستنوێژم نەبوایە ئەوا پێم دەوتن کە رافضة چی دەڵێن .

**٢١٨** - وە المغيرة وتی : جرير بن عبدالله، و عدي بن حاتم، و حنظلة ی نوسەر دەرچوون لە کوفە تا گەیشتنە قرقیسیاء، وە وتیان : لە ناوچەیەك نیشتەجێ نابین کە جنێو بە هاوەڵی رسول الله ﷺ عثمان بن عفان بدرێ رضي الله عنه .

**٢١٩** - وە احمد بن عبدالله بن یونس وتی : محمد بن عبدالعزیزماڵەکەی فرۆشت، وتی : لە کوفە نیشتەجێ نابم؛ چونکە ناوچەیەکە کە تێیدا جنێو بە هاوەڵانی رسول الله ﷺ دەدرێت .

---

: لەبەرئەوەی کوفە رافضەی زۆری لێبووە .

**٢٢٠** - وە العوام بن الحوشب وتی : گەیشتم بەوەی کە پێی گەیشتم لە پێشینی ئەم ئوممەتە کە هەندێکیان بە هەندێکیان دەوت : باسی چاکەکانی هاوەڵانی رسول الله

ﷺ بکەن بۆ ئەوەی دڵەکان پێی تەبا بن، وە باسی ئەو ناکۆکیەی نێوانیان مەکەن، چونکە نێوانی خەڵکی پێ تێك دەدەن .

**٢٢١** - وە سفیان بن عیینة وتی : دڵی هیچ کەس کینەی تێدا نییە بەرامبەر یەکێك لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ ، ئیللا دڵی کینەی زیاتر تێدایە بەرامبەر بە موسڵمانان .

**٢٢٢** - وە سفیان وتی : ﴿تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ﴾ [البقرة : ١٣٤]، وتی : هاوەڵانی محمد ﷺ .

**٢٢٣** - وە الشعبي وتی : سەیری ئارەزووەکانم کرد، و لەگەڵ ئەهلەکەیدا قسەم کرد، جا هیچ قەومێکم نەبینی کەم عەقڵتر بن لە الخشبیة .

: الخشبیة تاقمێکن لە رافضة، وە دەربارەی ناوەکەیان وتەی جیاواز هەیە، یەکێك لەوانە ئەوەیە کە تەنیا لەگەڵ پێشەوایەکی معصوم دا بە شمشێر شەڕ دەکەن، وە لەگەڵ هی دیکەدا بە تەختە دەیکەن!

**٢٢٤** - وە العاصم بن ضمرة وتی : بە حسن بن علي م وت : شیعە پێیان وایە کە علي دەگەڕێتەوە - واتە زیندوو دەبێتەوە پێش هاتنی قیامەت! - .

فەرمووی : درۆیان کرد، خۆ ئەگەر ئەوەمان بزانیایە ژنەکانی هاوسەرگیریان نەدەکردەوە، و سامانەکەشیمان بەش نەدەکرد .

**٢٢٥** - وه سفيان الثوري وتى : هەر كەس علي بە باشتر بزانێ لە ابو بكر و عمر، ئەوا عەیبداری كردوون، وه ئەوانەشی عەیبدار كردووه كە لەوان بە باشتر زانراون .

---

: واته بەو قسەیە هەردوو امام ابو بكر و عمرى عەیبدار كردووه لەگەڵ ماوەڵانی تریشدا، والله اعلم .

**٢٢٦** - وه جابر بن يزيد الجعفي وتى : محمد بن علي پێی وتم : ئەی جابر، پێم گەیشتووه كە كۆمەڵانێك لە عێراق بە دۆستی خۆیانمان دەزانن، جنێو بە ابو بكر و عمر دەدەن، وه لافی ئەوه لێدەدەن كە ئێمەیان خۆش دەوێ، و لافی ئەوه لێدەدەن كە من فەرمانم بەوه پێ كردوون!، جا پێیان بگەیەنە كە من لای الله لەوان بەریم، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر بە دەست من بوایە ئەوا لە الله عز و جل نزیك دەبوومەوه بە ڕشتنی خوێنی ئەوان، بەڕاستی دوژمنانی الله تعالى بێ ئاگان لەوان - واته لە ابو بكر و عمر - .

**٢٢٧** - وه جابر وتى : كۆمەڵێك لە خەڵكی هاتن بۆ لای علي بن الحسين، و ستایشیان كرد .

فەرمووی : ئێوه چەند درۆزن و چاوقاییمن بەرامبەر الله عز و جل! ئێمە لە چاكەكانی قەومی خۆمانین، وه بەسە بۆمان كە لە چاكەكانی قەومی خۆمان بین .

**٢٢٨** - وه سليمان بن قرم الضبي وتى : لای عبدالله بن الحسن بن الحسن بووم، پیاوێك پێی وت : الله چاكسازی حاڵت بكا، ئایا كەسێك هەیە لە ئەهلی قیبلەكەمان

شاهێدی بە شیرك لەسەر بدەین؟ - واتە کەس هەیە نوێژ بکا ڕووەو قیبلە پێشی بڵێین شیرکی کردووە؟ -

وتی : بەڵێ، رافضەکان، شاهێدی دەدەم کە ئەوان موشریکن؛ جا چۆن موشریك نابن لە کاتێکدا لێیان بپرسیت : ئایا پێغەمبەر ﷺ تاوانی ئەنجام داوە؟ دەڵێن : بەڵێ .

کە الله لە گوناهی ڕابردوو و داهاتووی خۆش بووە .

خۆ ئەگەر پێیان بڵێی : ئایا علي تاوانی ئەنجام داوە؟ دەڵێن : نا؛ جا هەر کەس وای وت، ئەوا کافر بووە .

---

: پێغەمبەران تەنها گوناهی بچوکیان ئەنجام داوە و لە گوناهی گەورە معصوم بوونە، والله اعلم .

**٢٢٩** - لە فضیل بن مرزوق وە، وتی : گوێم لە عبدالله بن الحسن بن الحسن بوو بە پیاوێکی رافضەی وت : سوێند بە الله ئەگەر لەبەر مافی دراوسێیەتی نەبوایە ئەوا کوشتنی تۆ نزیك بوونەوە دەبوو لە الله .

**٢٣٠** - وە جابر بن رفاعة وتی : پرسیارم لە جعفر بن محمد رضي الله عنه کرد دەربارەی ابو بکر و عمر رضي الله عنهما؟

وتی : الله نەمخاتە بەر شەفاعەتی محمد ﷺ ئەگەر نزیك نەبمەوە لە الله بە خۆشویستنیان، و سەڵاوات دان لە سەریان .

**٢٣١** - وه الحسن بن صالح وتی : پرسیارم له جعفر بن محمد کرد دەربارەی ابو بکر و عمر؟

وتی : بەریم له هەر کەس که باسیان بکات مەگەر به چاکه نەبێ .

وتم : لەوانەیه تۆ له ترسدا وا بڵێی .

وتی : ئەو کات من له موشریکەکانم، وه الله نەمخاته بەر شەفاعەتی محمد ﷺ ئەگەر له الله عز و جل نزیك نەبمەوه به خۆشویستنیان؛ بەڵام کۆمەڵێك هەن وا له خەڵکی دەکەن قسەمان پێ بڵێن .

**٢٣٢** - وه ابو الخالد الاحمر وتی : پرسیارم کرد له عبدالله بن الحسن بن الحسن رضي الله عنهما دەربارەی ابو بکر و عمر رضي الله عنهما؟

وتی : درودی الله یان لەسەر بێ، وه دروودی الله لەسەر ئەوانه نەبێ که سەڵاواتیان لەسەر نادەن، ئێمه سبەینێ بەرین لەوانەی که دەمانکەنه دوژمنیان .

**٢٣٣** - وه محمد بن علي بن الحسین وتی : هەر کەسێك ئێمەی به باشتر زانی له ابو بکر و عمر بەرییه له سوننەتی باپیرمان ﷺ، وه ئێمه سبەینێ لای الله عز و جل دوژمنی ئەوین .

**٢٣٤** - وه علي بن ابي طالب رضي الله عنه فەرمووی : پێغەمبەر ﷺ پێمی فەرموو : (قەومێك دێن نازناوێکیان هەیه که پێیان دەوترێ : رافضة، له هەر شوێنێك بینیتن بیانکوژه، چونکه ئەوان موشریکن)

وتم : يا رسول الله، نيشانەيان چييە؟

فەرمووی : (ستایشت دەكەن بەوەی كە لە تۆدا نییە، وە توانج لە پێشین دەدەن) .

**٢٣٥** - وە علي رضي الله عنه فەرمووی : ئەم ئوممەتە دابەش دەبێ بۆ سەر حەفتا و ئەوەندە كۆمەڵە - كەمتر لە حەفتا و چوار - , خراپترینیان كۆمەڵێكن كە بانگەشەی خۆشویستنمان دەكەن، و سەرپێچی فەرمانیشمان دەكەن .

**٢٣٦** - وە علي رضي الله عنه فەرمووی : دوو كەس لەبەر من تیا دەچێت : كەسێك كە زیاد لە حەد خۆشی دەوێم، وە كەسێك كە بوختان چییە و ڕقی لێمە .

**٢٣٧** - عبدالملك بن عبدالحميد الميموني وتی : احمد بن حنبل رحمة الله عليه پێی وتم : ئەی باوكی الحسن، هەر كات بینیت پیاوێك بە خراپە باسی پیاوێك لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ دەكا ئەوا تۆمەتباری بكە لەسەر ئیسلام .

**٢٣٨** - وە علي بن ابي طالب رضي الله عنه فەرمووی : پێغەمبەر ﷺ پێمی فەرموو : (قەومێك دەردەچن لە پێش هاتنی قیامەتەوە كە پێیان دەوترێ : رافضة، بەرین لە ئیسلام) .

---

: ئەم فەرموودەیە العقيلي بە ضعيف دای ناوە .

**٢٣٩** - علي رضي الله عنه به نوف البكالي وت كه له‌گه‌ڵیدا بوو له‌سه‌ر سه‌كۆیه‌ك : ئه‌ی نوف ده‌زانی خۆشه‌ویستان و به‌ره‌ی من كێن ؟

وتی : نا والله .

فه‌رمووی : خۆشه‌ویستانم ئه‌وانه‌ن : كه لێویان وشكه، گه‌ده‌یان خاڵییه، دونیا نه‌ویستی و زانست و خواپه‌رستی له ڕوخساریان به‌دی ده‌كه‌ی، به شه‌و دونیا نه‌ویستن، به ڕۆژیش شێرن، ئه‌گه‌ر شه‌ویان به‌سه‌ر بێت پشتوێنه‌كانیان توند ده‌كه‌نه‌وه - بۆ ئه‌وه‌ی باشتر به‌ندایه‌تی بكه‌ن - ، وه عه‌با ده‌ده‌ن به‌سه‌ر پشتیاندا - واته وه‌كو ئه‌وانه‌ی له حه‌جن - ، و ناڵه ده‌كه‌ن هه‌ر وه‌ك ئه‌و گایانه‌ی سه‌ریان ده‌بڕدرێ ناڵه ده‌كه‌ن - واته به كوڵ ده‌گرین له ترسی الله - .

خۆشه‌ویستانم ئه‌وانه‌ن كه : ئه‌گه‌ر بینران ناناسرێن - واته دوورن له ناوبانگ - ، وه ئه‌گه‌ر داوای هاوسه‌ر بكه‌ن هاوسه‌رگیریان له‌گه‌ڵ ناكرێ - چونكه خاوه‌ن سامان و پله و پایه نین - ، وه ئه‌گه‌ر نه‌خۆش كه‌وتن سه‌ردان ناكرێن، وه ئه‌گه‌ر دیار نه‌مان كه‌س بیریان ناكا .

خۆشه‌ویستانم : ئه‌وانه‌ن كه له ماڵ و سامانیان یارمه‌تی خه‌ڵكی پێده‌ده‌ن، و له پێناو الله ده‌یبه‌خشن : درهه‌م و درهه‌م، فلس و فلس، و جل و جل، مه‌گه‌ر نه‌یانبێ .

خۆشه‌ویستانم : ئه‌وانه‌ن كه هه‌نسكه هه‌نسكی سه‌گ ناكه‌ن، وه وه‌كو قه‌له‌ڕه‌شیش به ته‌ماع نین، داوا له خه‌ڵكی ناكه‌ن ئه‌گه‌ر له برسیشدا بمرن، ئه‌گه‌ر ئیماندارێك ببینن ڕێزی لێ ده‌گرن، وه ئه‌گه‌ر فاسقێك ببینن هه‌جری ده‌كه‌ن .

والله ئەوانە خۆشەویستانی منن ئەی نوف؛ خەڵکی لە خراپەیان ئەمینە، وە دڵیان بە خەفەتە، وە پێویستیەکانیان سوك و ئاسانە، وە نەفسیان پاکە، ئەگەر بچنە ناوچەیەکی جیاواز دڵیان ناگۆڕێت .

ئەمما لە شەودا : قاچەکانیان بۆ نوێژ دادەنێن، وە ناوچەوانیان بۆ سوجدە، فرمێسکەکانیان بەسەر ڕومەتەکانیان دەڕژێ، لە تاو ئەوەی ئاگر توشی گەردنیان نەبێ دەگرین .

بەڵام لە ڕۆژدا : نەرم و نیانن، زانان، خانەدان، و بەڕێزن، چاکەکار، و تەقوادارن .

ئەی نوف خۆشەویستانم : ئەوانەن کە زەویان کردووە بە جێگا - واتە پێخەف و شوێنی دانیشتنیانە - , وە ئاویان کردۆتە پاککەرەوە، و قورئانیان کردووەتە شعار - شعار واتە ئەو جلەی ڕاستەوخۆ جەستە دادەپۆشێ - ، وە دوعایان کردووەتە دثار – دثار یش ئەو جلەیە کە لەسەر شعارەوە لەبەر دەکرێ - ، دونیایان بەس بۆ پێویستی خۆیان دەوێ و زۆر داوا ناکەن، لەسەر مەنهەجی عیسى بن مريم ن عليه السلام .

# بەشی دووەم

## بنچینەکانی سوننەت و بیروباوەڕی سەلەف



الشيخ ابو عبدالله **إِبْنُ بَطَّة** رحمه الله فەرمووی :

براکەم الله ڕەحمت پێ بکا، وە بە علم سود بە من و تۆ بگەیەنێ، و وامان لێ بکات کاری پێ بکەین، وە تەوفیقمان بدا بۆ سوننەت، و لەسەری بمانمرێنێ؛ هاتینە خزمەت کۆمەڵێك لە وتەکانی زانایان، و ئەو هەواڵانەی لە المصطفى وە ﷺ هاتوون لە بارەی ئاگادار کردنەوە و ترساندنەوە، وە لە بارەی عوزردان و ترساندن لە کەوتنە ناو بیدعەوە، وە لەوەش کە فەرمانیان پێکراوە بە دەست گرتن بە سوننەتەوە، وە پارێزگاری لێکردنی، وە ڕوو تێکردنی، و پشت کردنە ئەو کەسەی کە سەرپێچی لێ کرد، وە جودا بوون لەوەی کە لەوە دەرچووە کە وێنەکەی ڕووی لە ئێمەیە، وە یادکردنی بۆمان ئاسان بووە کە لە هەندێکیدا کیفایەت و دەوڵەمەندی هەیە بۆ هەر کەسێك کە الله عز و جل خێری بۆی بوێت، و لە دڵیدا کەمترین ژیان مابێ .

وە ئێمە ئێستا باسی شەرحی سوننەت، و وەصفەکەی دەکەین، وە ئەوەش کە خودی خۆی چییە، وە ئەوەی کە ئەگەر بەندە دەستی پێوە گرت ئەوا دینداری اللّٰه ی پێکردووە؛ ناوی لێنراوە، وە موستەحەقی چونە ناو کۆمەڵەکەی بووە - واتە باسی ئەو شتانە دەکەین کە بکەرەکەی موستەحەقە پێی بوترێ سوننی و لە ئەهلی سوننە و جەماعەیە - .

وە ئەگەر سەرپێچی یان شتێکی لێ بکا، دەکەوێتە کۆمەڵەی ئەو کەسانەی کە عەیبدارمان کردوون، و باسمان کردون، و ئاگاداریمان لێداون کە ئەوان لە ئەهلی بیدەع و زەیغ و لادانن لەو شتانەی کە ئێمە شەرحی دەکەین کە ئیجماعی ئەهلی ئیسلامی لەسەرە، وە باقی ئوممەتی لەسەر بووە لەو کاتەوەی کە اللّٰه پێغەمبەرەکەی محمد ﷺ ی ناردووە تا ئەم کاتەی ئێستامان .

## جا یەکەم شت کە دەست دەکەین بە باسکردنی بریتیە لە :

**٢٤٠** - باسکردنی ئەوەی اللّٰه عز و جل فەرزی کردووە لەسەر بەندەکانی، وە پێغەمبەرەکەی ﷺ پێ ناردووە، وە لەبارەیەوە کتێبەکەی دابەزاندووە؛ ئەویش ئیمان هێنانە بە اللّٰه عز و جل .

وە واتاکەی بریتیە لە : بە ڕاست خستنەوەی ئەوەی کە فەرموویەتی، و فەرمانی پێکردووە، و بە فەرزی داناوە، وە ئەوەش کە نەهی لێکردووە، لە هەموو ئەوەی کە پێغەمبەران لە لایەن خۆیەوە پێی هاتوون، وە کتێبی لە بارەیانەوە دابەزاندووە .

وە بەمە پێغەمبەرانی ناردووە، جا فەرموویەتی : ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيْهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدُونِ﴾ [الأنبياء : ٢٥] .

**٢٤١** - وە بە ڕاست خستنەوەی ئەمە : وتەیە بە زمان، و بە ڕاست خستنەوەیە لە ناخەوە، وە کردەوەیە بە ئەندامەکان .

**٢٤٢** - ئیمان - زیاد دەبێت بە : کردەوەی زۆر، و وتەی چاکە، و کەم دەکات بە : سەرپێچی کردن .

وە سەرەتایەك و کۆتاییەکی هەیە، پاشان بەرزبوونەوە و زیادکردن بە بێ کۆتا .

هەروەکو الله عز و جل فەرموویەتی : ﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ﴾ [آل عمران : ١٧٣].

وە فەرموویەتی : ﴿وَيَزْدَادَ الَّذِينَ آمَنُوا إِيمَانًا﴾ [المدثر : ٣١] .

وە فەرموویەتی : ﴿لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَعَ إِيمَانِهِمْ﴾ [الفتح : ٤] .

**٢٤٣** - وە معاذ بن جبل رضي الله عنه بە پیاوێکی فەرموو : دامان نیشێنە با کاتژمێرێك ئیمان بهێنین .

- **إِبْنُ بَطَّة** وتی - واتە : یادی الله تعالى بکەین، و ئیمانمان زیاد بکات .

وە هەر شتێك کە زیاد بکات کەمیش دەکات .

**٢٤٤** - پاشان جیاکاری کردن - الإستثناء - لە ئیماندا؛ ئەویش بەوە دەبێ کە پیاو بڵێ : من ئیماندارم ان شاء الله .

**٢٤٥** - عبدالله بن مسعود رضي الله عنه هەر ئەمەی دەوت .

وە زانایانی دوای خۆی ئاوما وەریانگرتووە، وەکو : علقمة، و الاسود، و ابي وائل، و مسروق، و منصور، و مغيرة، و ابراهيم النخعي، و الاعمش، و حماد بن زيد، و يزيد بن زريغ، بشر بن المفضل، و معاذ بن معاذ، و سفيان بن حبيب، و سفيان الثوري، و ابن المبارك، و الفضيل بن العياض وە کۆمەڵێکی تر لە غەیری ئەمان کە بە باس کردنیان کتێبەکە درێژ دەبێتەوە .

وە ئەم جیاکاریە لەسەر یەقین و دڵنیاییە؛ هەروەکو الله عز و جل فەرموویەتی : ﴿لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ آمِنِينَ﴾ [الفتح : ٢٧] .

---

: لە ئایەتەکەی سەرەوەدا الله فەرموویەتی : ان شاء الله دەچنە ناو مزگەوتی حەرامەوە واتە کەعبە بە سەلامەتی، ئەمەش موژدەی فەتحی مەککە بوو بۆ موسڵمانان، جا **امام احمد** لە (**طبقات الحنابلة - ١٨١/٢**) دەڵێ : دەیزانی دەچنە ناوی، کەچی جیاکاری کرد.

واتە جیاکاری کردن لەبەر گومان نییە؛ کە تۆ دەڵێی من ئیماندارم ان شاء الله مانای وا نییە گومانت لە ئیمانی خۆت هەبێ چونکە هەبوونی گومان لە ئیمانەکەت یەکسانە بە کوفر، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە لە قورئاندا بە ڕەهایی باس کراوە کە ئیمانداران دەچنە بە هەشت، هەروەها کەس نازانێ ئاخۆ الله ئیمانەکەی لێ وەردەگرێ یان نا، جا کە تۆ بڵێی ئیماندارم بە بێ جیاکاری واتە بە بێ وتنی ان شاء الله؛ ئەوا وەکو چاو قاییمیەکی لێ دێ بەرامبەر بە الله تعالى، وە ئەوانەی کە جیاکاریان نەدەکرد مورجیئەکان بوون، جا بۆ بەرچاوڕوونی زیاتر لەم بابەتەدا بیروباوەڕی ئیمامی الأوزاعي بخوێننەوە .

**٢٤٦** - وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (من ئومێدم وایە کە تەقوادارترینتان بم بۆ الله عز و جل) .

---

: گومان لەوەدا نییە کە ئەو ﷺ تەقوادارترین بووە و کەس پێشی ناکەوێ، بەڵام جیاکاری کرد .

**٢٤٧** - وە ئەو ﷺ کاتێك بەلای گۆڕستانی بەقیعدا تێپەڕی فەرمووی : (ئێمەش ان شاء الله پێتان دەگەینەوە) - رسول الله ﷺ دڵنیابوو لەوەی کە وەفات دەکا بەڵام جیاکاری کرد .

جا ئەمە هەمووی جیاکاریە لەسەر دڵنیایی .

بەڵام پێویستە لەسەر هەر کەسێك کە جیاکاری دەکات بزانێ کە : چۆن جیاکاری دەکات؟ وە لەبەر چ هۆکارێك جیاکاری تێکەوت؟ بۆ ئەوەی کەسی سەرپێچیکار - واتە مورجیئە - وا تێنەگات کە جیاکاری لەبەر گومان کردووە .

**٢٤٨** - چونکە سفیان الثوري و ابن المبارك دەیان وت : خەڵکی لای ئێمە ئیماندارن لە میرات و ئەحکامەکاندا، وە ئێمە نازانین ئەوان لای الله عز و جل چۆنن، و لەسەر چ دینێکیش دەمرن .

چونکە جیاکاری واقعێکە لەسەر ئەوەی لە داهاتوودا دێت؛ لەبەر ئەوەی وتەی بەندە کە دەڵێ : من ئیماندارم ان شاء الله، واتە : ئەگەر الله ئیمانەکەمی وەرگرت، وە لەسەری مراندمی، وەکو کەسێکە کە نوێژێکی کردووە، پاشان وتویەتی : نوێژم کرد، و قبوڵ بوونی نوێژەکەم لای الله یە .

وه بەم شێوەیەش بۆ حەج، و بەم شێوەیەش ئەگەر بە ڕۆژوو بوو، یان کردەوەیەکی کرد، چونکە جیاکاریەکەی دەکەوێتە سەر خاتیمەکەی، و قبوڵ کردنی ئەوە لە لایەن اللە ـوەیە؛ نەك ئەوە بێت کە ئەو گومانی هەبێ لەوەی کە وتویەتی یان کردویەتی .

وە پیاو دەبینرێ کە نوێژ دەکات جا پێی دەوترێ : نوێژت کرد؟

دەڵێت : بەڵێ، ئەگەر لێم قبوڵ بکرێت .

**٢٤٩** - پاشان لە دوای ئەمە : بزانیت کە واتای ئیسلام بریتی نییە لە ئیمان؛

(الإسلام) : ناوێکە، وە واتاکەی : دینە - المِلَّة - .

وە (الإیمان) : ناوێکە، وە واتاکەی : بە ڕاست خستنەوەیە - التَّصدیق - .

اللە عز و جل فەرموویەتی : ﴿وَمَا أَنْتَ بِمُؤْمِنٍ لَنَا﴾ [یوسف : ١٧] مەبەستی ئەوەیە کە : بە ڕاستخەرەوەمان نیت .

---

: ئەم ئایەتە باس لەو کاتە دەکات کە براکانی پێغەمبەر یوسف علیه السلام بە باوکیان وت یوسف گورگ خواردی، جا وەك لە ئایەتەکە هاتووە بە باوکیان دەڵێن تۆ بڕوامان پێ ناکەی مەبەستیان ئەوەیە بە ڕاستمان ناخەیتەوە .

وە ئایەت بۆ ڕاستی و دروستی ئەوەی وتمان زۆرن، لەوانە : ﴿قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا قُل لَّمْ تُؤْمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسْلَمْنَا﴾ [الحجرات : ١٤] .

: لێرە کە دەڵێت ئیمان واتە بە ڕاست خستنەوە، ئەمە هەمان قسەی موڕجیئەکان نییە، بەڵکو ئەم پێناسەیە بۆ ئیمان لە ڕووی زمانەوانیەوەیە، بەڵام لە ڕووی شەرعەوە بریتیە لە نیەت و وتە و کردەوە، هەر وەکو إمام لە ئەثەری **٢٤١** وتویەتی، جا کە ئەهلی سوننە وتویانە ئیمان واتە بەڕاست خستنەوە، مەبەستیان : بە ڕاست خستنەوەیەکی ملکەچییانە و پابەندانە بووە لە دەرەوە و ناخیشیاندا بە بێ شك و گومان، چونکە ئیبلیس کاتێك سوجدەی نەبرد بڕوای بە الله هەبوو، بەڵام ملکەچ و پابەند نەبوو بۆی، جا ئەم پێناسەیەش کە بۆ ئیسلام و ئیمان کراوە ڕەدد بووە بۆ موڕجیئە چونکە پێیان وایە ئیسلام و ئیمان یەك شتن .

**٢٥٠** - وە پیاو لە ئیمانەوە دەردەچێت بۆ ئیسلام، وە هیچ شتێك لە ئیسلام دەری ناکات جگە لە : هاوبەش دانان بۆ الله .

یان بە ڕەت کردنەوەی فەرزێك لە فەرزەکانی الله عز و جل بە نکۆڵییەوە، جا ئەگەر لەبەر ئیهمالی و تەمبەڵی وازی لێ هێنا؛ ئەوا لە ژێر ویستی الله عز و جل دایە؛ ئەگەر ویستی لێبوو سزای دەدا، وە ئەگەر ویستی لێبوو لێی خۆش دەبێت .

: کە دەڵێت لە ئیمانەوە دەردەچێ بۆ ئیسلام مەبەستی ئەو فەرموودەیە کە دەفەرموێ : (زیناکار زینا ناکات لە کاتی زیناکەیدا ئیماندار بێ)، واتە لە کاتی زینادا ئیمانەکەی لێی جیا دەبێتەوە و لە بازنەی ئیمانەوە دەردەچێ بۆ بازنەی ئیسلام، واتە هەر موسڵمانە بەڵام ئیمانەکەی لێی دەرچووە .

هەروەها کە دەڵێ ئەگەر بە تەمبەڵی بوو لە ژێر ویستی الله دایە، ئەوا مەبەستی نوێژ نییە، چونکە **إِبْنُ بَطَّة** لە کتێبی (**الإبانة الكبرى**) بابێکی داناوە تایبەت بە تەکفیر کردنی ئەو کەسەی وازی لە نوێژ هێناوە کە ناوی بابەکەی بریتیە لە : (باب كفر تارك الصلاة، و مانع الزكاة، و اباحة قتلهم، و قتلهم اذا

فعلوا ذلك), وە هەروەها فەرموودەی صحيح و اجماعيش هەيە لەسەر تەكفير كردنی ئەو كەسەی وازی لە نوێژ هێناوە ئەگەر چی لەبەر تەمبەڵیش بێ، وەكو ئەوەی كە پێغەمبەر ﷺ فەرموويەتی : (نێوان پياو و نێوان شرك و كوفر وازهێنانە لە نوێژ), وە **محمد بن نصر المروزي** لە (**تعظيم قدر الصلاة - ٩٤٨**) ڕیوایەتی كردووە كە عبدالله بن شقيق دەڵێ : هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پێيان وانەبوو وازهێنان لە هيچ شتێك لە كردەوەكان كوفر بێت جگە لە نوێژ.

وە لە [**الإبانة الكبرى : ٤٨١/١**] **إِبْنُ بَطَّة** ئەڵێت : اللَّه تعالى دەفەرمووێت : ﴿وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ .

اللَّه تعالى كردی بە موشريک و دەرچوو لەئيمان ئەو كەسەی واز لەنوێژ بهێنێت.

**٢٥٠** - پاشان لە دوای ئەوە بزانيت بە بێ گومان و دوو دڵی و لێ وەستان : كە قورئان كەلامی الله يە و وەحييەتی، و دابەزێنراويەتی، تێيدا واتاكانی بە تاك ڕاگرتنی هەيە، وە ناسينی و بەڵگەكانی و سيفاتەكانی و ناوەكانی تێدا هەيە، وە زانستێكە لە زانستەكانی و غەيری مەخلوقە، وە بە هەر شێوازێك خوێندرايەوە، و بە هەر شێوەيەك نوسرايەوە، و لەو كاتەش كە تيلاوە كرا، وە لە هەر بارێكدا، لە ئاسماندا بێت ياخود لە زەوی، پارێزرابێ لە لوح المحفوظ و لە پەڕاوەكاندا، وە لە لەوحەی منداڵاندا كێشرابێت، يان لەسەر بەرد نەخشێنرابێت، وە لەسەر هەموو حاڵەتەكانی و جيهاتەكانی؛ ئەوا هەر كەلامی الله يە و مەخلوقيش نييە .

**أ** - جا هەر كەس وتی : مەخلوقە .

**ب** - يان وتی : كەلامی الله يە و لێی وەستا و گومانی هەبوو .

**ج** - یان بە زمانی وتی، و لە نەفسی خۆیدا پێی وابوو و شاردیەوە؛

ئەوا کافرە بە الله، خوێنی حەڵاڵە، بەریيە لە الله و الله ش لەو بەریيە.

وە هەر کەسێك گومانی لە کوفرەکەی هەبوو، و وەستا لە تەکفیر کردنی : ئەوا ئەویش کافرە بە فەرمایشتی الله عز و جل کە فەرموویەتی : ﴿بَلْ هُوَ قُرْءَانٌ مَّجِيدٌ (٢١) فِي لَوْحٍ مَّحْفُوظٍ (٢٢)﴾ [البروج : ٢١ - ٢٢] .

یاخود : ﴿حَتَّى يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ﴾ [التوبة : ٦] .

یاخود : ﴿ذَلِكَ أَمْرُ اللَّهِ أَنْزَلَهُ إِلَيْكُمْ وَمَنْ ﴾ [الطلاق : ٥] .

جا هەر کەس پێی وابێت کە یەك پیت لێی مەخلوقە : ئەوا کافر بووە بە بێ هیچ گومانێك.

چونکە ئایەت دەربارەی ئەوە لە قورئاندا، و بەڵگە لە المصطفى وە ﷺ زیاترن لەوەی کە بژمێردرێن، وە ئاشکراترن لەوەی کە بشاردرێنەوە .

---

: **إِبْنُ بَطَّة** لەم ئەثەرەدا ڕەددی جەهمیەکان و لفظیە جەهمیەکان و کوللابیەکان و ئەشعەری وماتوریدیە جەهمیەکان ئەداتەوە، ئیمام ئەڵێت : (وە بە هەر شێوازێك خوێندرایەوە، و بە هەر شێوەیەك نوسرایەوە، و لەو کاتەش کە تیلاوە کرا، وە لە هەر بارێکدا، لە ئاسماندا بێت یاخود لە زەوی، پارێزراێ لە لوح المحفوظ و لە پەڕاوەکاندا، وە لە لەوحەی منداڵاندا کێشرابێت، یان لەسەر بەرد نەخشێنرابێت، وە لەسەر هەموو حاڵەتەکانی و جیهاتەکانی؛ ئەوا هەر کەلامی الله یە و مەخلوقیش نییە)، لفظی و ئەشعەریە جەهمییەکان و کوللابیەکان پێیان وایە ئەم قورئانەی سەر زەوی کەلامی الله تعالى نییە و مەخلوق ە، وە پێیان وایە دوو قورئان هەیە، وە هەموو ئەو کۆمەڵانە لەلایەن سەلەفەوە تەکفیر کراون .

**٢٥٢** - پاشان ئیمان هێنان بە سیفاتەکانی الله تبارك و تعالی : بەوەی کە الله تعالی زیندووە، قسە دەکات، بیسەر و بینەرە، نهێنی و شاراوە دەزانێت، وە ئەوەش کە لە زەوی و ئاسماندایە و ئەوەش کە لە نێوانیانە، وە ئەوەش کە دیارە، وە ئەوەش کە لە ژێر خاکدایە، وە الله حکیم و علیم، و عزیز و قدیر، و ودود و رؤوف رحیم ە، دەبیستێ و دەبینێ، وە ئەو لەسەری سەرەوەیە، وە ئەو ڕزق کەم و زیاد دەکات، وە دەگرێتەوە و دەبەخشێت، وە لەسەر عەرشەکەیەتی، جیایە لە دروستکراوەکانی، دەمرێنێ و دەژیێنێ، وە هەژاریان دەکا و دەوڵەمەندیان دەکا، وە تووڕە دەبێ و ڕەزامەند دەبێ، وە قسە دەکا و پێ دەکەنێ، ﴿لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ﴾ [البقرة : ٢٥٥]، ﴿وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾ [الأنعام : ٥٩] .

**٢٥٣** - وە لە پاش ئەمە بزانیت : کە ئەو بە شکۆوە خۆی دەردەخا بۆ بەندە ئیماندارەکانی لە ڕۆژی قیامەتدا جا دەیبینن و ئەویش ئەوان دەبینێ، وە قسەیان لەگەڵ دەکات و قسەی لەگەڵ دەکەن، وە سەلامیان لێ دەکات هەر وەکو فەرموویەتی : ﴿سَلَامٌ قَوْلًا مِن رَّبٍّ رَّحِيمٍ﴾ [یس : ٥٨]، وە پێدەکەنێت بۆیان، و ئەوانیش بۆی پێدەکەنن، لەمەدا توشی ناڕەحەتی نابن، وە توشی شك و گومان نابن .

جا هەر کەس ئەمەی بە درۆ خستەوە، یان ڕەتی کردەوە، یان گومانی لێ هەبوو، یان تانەی دا لەوەی کە دەیگێڕێتەوە، ئەوا گەورەترین درۆی لەسەر الله عز و جل هەڵبەستووە، وە بەری بووە لە الله و پێغەمبەرەکەی، وە الله و پێغەمبەرەکەی لەو بەریین، زانایان ئەمەیان وتووە، وە هەندێکیان سوێندیان لەسەری خواردووە .

**٢٥٤** - پاشان لە دوای ئەمە : ئیمان هێنان بە قەدەر بە خێر و شەڕەوە، وە بە شیرین و تاڵییەوە، وە بە کەم و زۆرییەوە؛ بەوەی کە تەقدیر کراوە و واقیعە لە لایەن الله عز و جل بۆ سەر بەندەکانی، لەو کاتەی کە ویستویەتی ڕوو بدا، کاتەکە پێش ناکەوێ، و دواش ناکەوێ، بە گوێرەی ئەوەی کە عیلمی پێشینەی الله ی لەسەر بووە .

وە ئەوەی تووشی بەندە بوو نەدەبوو نەیپێکێ، وە ئەوەی نەیپێکا نەدەبوو توشی بێ، وە ئەوەی پێش کەوت نەدەبوو دواکەوێ، وە ئەوەی کە دواکەوت نەدەبوو پێش بکەوێ - واتە بەندە هەرچی بەسەرهات ئەوا بۆی نوسراوە و هەر دەبوو توشی بێ وە پێش و دوا ناکەوێ، وە هەر شتێکی تووش نەبووە ئەوا بۆی نەنوسراوە و نابێ توشی بێ - .

وە لەمەدا لە ڕاستی و دروستی بەڵگەکان، و جێگیر بوونی حوججە لە هەموو قورئان، وە ئەو هەواڵانەش کە لە المصطفى ـوە ﷺ هاتوون ناکرێ لاببرێن، وە ناتوانرێ ڕەد بکرێنەوە ئیللا بە درۆ هەڵبەستن نەبێ لەسەر الله عز و جل، وە ناکۆکی و مشتومڕ کردن لەگەڵی دەربارەی قودرەتەکەی .

وە ئەوەی ئێمە وەسفمان کرد پێغەمبەران بانگەوازیان بۆ کردووە، وە کتێبەکان دەربارەیان دابەزێنراوە، وە کۆڕایی ئەهلی تەوحیدی لەسەرە لەوانەی کە دانیان بە پەروەردگارێتی الله ـدا ناوە، وە لەسەر خۆیان دانیان بە پەرستن ناوە - واتە پەرستن بۆ الله دەکەن - ، هەر فریشتەیەکی نزیك کراو، وە هەر پێغەمبەرێکی نێردراو لەوەتەی کە خەلق بوونی هەیە تاکو فەوتانی :

كۆدەنگن لەسەر ئەوەی هیچ شتێك نەبووە، و هیچ شتێك نابێ نە لە ئاسمانەکان، و نە لە زەوی؛ ئیللا الله عز و جل مەبەستی بووە و ویستویەتی و بڕیاری لەسەر داوە، وە دروستکراوەکان لاوازترن لە هێزیان، و بێ تواناترن لە خودی خۆیان کە لە ژێر دەسەڵاتی الله عز و جل شتێك بکەن کە پێچەوانەی ویستی الله بێت، و بەسەر ویستەکەیدا زاڵ بن، وە بڕیارەکەی ڕەد بکەنەوە .

جا ئیمان هێنان بەمە ڕاست و پێویستە؛ فەرزێکە لە لایەن الله عز و جل بۆ سەر دروستکراوەکانی .

بۆیە هەر کەسێك پێچەوانەی ئەمە بکات، یان لێی دەرچێت، یان توانجی لێبدات، وە قەدەرەکان بۆ الله عز و جل جێگیر نەکات، وە بیداتە پاڵی، و ویستەکە بداتە پاڵ خۆی؛ ئەوا سەرەتای زندیقیەتە؛ لەبەر ئەوەی هەواڵەکان هاتوون : کە قەدەر (ابو جاد) ی زندیقیەتە .

---

: واتە یەکەمین ڕێگا بەرەو زندیقیەت و کوفر قسە کردنە لە قەدەردا، هەروەکو چۆن یەکەم هەنگاو بۆ فێربوونی زمانی عەرەبی؛ فێربوونی حروفە ئەبجەدیەکانە، والله اعلم .

**٢٥٥** - وە فەرمووی ﷺ : (قەدەریەکان و موڕجیئەکان بە لەعنەت کراون لەسەر زمانی حەفتا پێغەمبەر، کە من کۆتا دانەیانم) .

---

: ئەم فەرموودەیە بە ضعیف دانراوە لە لایەن : الدارقطني و جگە لەویش .

**٢٥٦** - وە فەرمووی ﷺ : (الله عز و جل بۆ هەر نەفسێك بەشی خۆی لە زینا نوسیوە) .

**٢٥٧** - پاشان ئیمان هێنان بە سزای گۆڕ، و منکر و نکیر .

**٢٥٨** - لەوەی کە البراء رضي الله عنه گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (پەنا بگرن بە الله لە سزای گۆڕ) .

**٢٥٩** - وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (مردوو لە گۆڕەکەیدا دادەنیشێنرێت) .

**٢٦٠** - وە فەرمووی ﷺ : (ئەگەر کەسێکتان ڕزگاری بوایە لە گۆڕەوشار یاخود گوشینی گۆڕ ئەوا سعد بن معاذ ڕزگاری دەبوو) .

**٢٦١** - وە الله فەرموویەتی : ﴿فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكًا﴾ [طه : ١٢٤]، هاوەڵانی تەفسیر وتوویانە : سزای گۆڕە .

**٢٦٢** - پاشان لە دوای ئەمە : ئیمان هێنان بە دەنگی زیندووبوونەوە بە دەنگی ئیسرافیل کە بۆ هەستانەوەیە لە گۆڕەکان .

دڵ پابەند دەکات بەوەی کە مردوویت، و گوشراوی لە گۆڕەکەتدا، وە پرسیار لێکراوی لە گۆڕەکەتدا، وە زیندوو دەبیتەوە لە دوای مردن کە فەرزێکی پێویستە؛ هەر کەس ئینکاری لێکرد ئەوا پێی کافر دەبێت .

**٢٦٣** - وه پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (ئێوه له گۆڕەکانتانەوه دەردەهێنرێن بۆ حەشر به پێی پەتی و به ڕووتی و خەتەنه نەکراوی) .

وه الله تبارك و تعالى فەرموویەتی : ﴿يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنَ الْأَجْدَاثِ سِرَاعًا﴾ [المعارج : ٤٣] .

جا هەر کەس ئایەتێك، یان پیتێکی له قورئان به درۆ خستەوه، یان شتێکی ڕەتکردەوه لەوەی رسول الله ﷺ پێی هاتووه؛ ئەوا کافره .

**٢٦٤** - پاشان ئیمان هێنان به زیندووبوونەوه، و الصراط، وه شیعاری ئیمانداران لەو ڕۆژەدا بریتیه له : پەروەردگارا سەلامەتمان که سەلامەتمان که .

**٢٦٥** - وه الصراط هاتووه له فەرموودەدا که : (تیژتره له شمشێر، وه باریکتره له موو) .

**٢٦٦** - پاشان ئیمان هێنان به تەرازووەکان؛ هەر وەکو الله تبارك و تعالى فەرموویەتی : ﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾ [الأنبياء : ٤٧] .

**٢٦٧** - وه عبدالله بن مسعود رضي الله عنه فەرمووی : خەڵکی له ڕۆژی قیامەتدا دەهێنرێن بۆ لای تەرازووەکان، وه لەوێدا موجادەله دەکەن به توندترین موجادەله .

**٢٦٨** - وه پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (تەرازوو به دەستی الرحمن ە، نزمی دەکاتەوه و بەرزی دەکاتەوه) .

جا هەر کەس گومانی لەمە هەبوو، یان بە درۆی خستەوە، ئەوا گەورەترین ئیلحادی ئەنجام داوە .

وە ئەهلی علم لەم هەواڵانەدا کۆڕاییان هەیە لە زانایان و دونیا نەویستان و خوا پەرستان لە هەموو وڵاتان کە : ئیمان هێنان بەمە واجبێکی پێویستە .

**٢٦٩** - پاشان ئیمان هێنان بە حەوز، و شەفاعەت .

**٢٧٠** - وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (حەوزێکم هەیە لە نێوان أيلة و عەدەن) مەبەستی ئەوەیە : ئەندازەکەی هێندەی نێوانی أيلة و عەدەنە (ژمارەی کوپەکانی هێندەی ئەستێرەکانی ئاسمانن) .

---

: أيلە شارێکە لەسەر دەریای قلزم لە شام، عەدەنیش شارێکە لە یەمەن .

**٢٧١** - وە انس بن مالك رضي الله عنه فەرمووی : هەر کەس حەوزی بە درۆ خستەوە ئەوا حەقی بە درۆ خستۆتەوە .

**٢٧٢** - وە لە فەرموودەدا هاتووە : (هەر کەس حەوزی بە درۆ خستەوە ئەوا لێی ناخواتەوە) .

---

: ئەم فەرموودەیە ضعیفە چونکە لە إسنادەکەی الحکم بن سنان و یزید الرقاشي هەیە .

**٢٧٣** - پاشان ئیمان هێنان به لێپرسینەوە؛ و ئەوەی کە اللە عز و جل لە هەموو کەم و زۆرێك دەپرسێتەوە لەو وەستانەدا [واتە وەستان لە ڕۆژی قیامەت, واللە اعلم]، وە لە هەموو ئەو تاوانانەی کە کردوویانە .

﴿لِيَسْأَلَ الصَّادِقِينَ عَنْ صِدْقِهِمْ﴾ [الأحزاب : ٨] .

وە اللە عز و جل فەرموویەتی : ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسْأَلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ (٩٢) عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ (٩٣)﴾ [الحجر : ٩٢ - ٩٣] .

وە حەق لە ستەم کاران دەسەنێتەوە بۆ ستەم لێکراوان، و لە ئاژەڵانی شاخدار بۆ بێ شاخ، وە لە بەهێز بۆ لاواز .

**٢٧٤** - پاشان ئیمان هێنان بەوەی کە اللە عز و جل بەهەشت و ئاگری دروست کردووە پێش دروستکردنی دروستکراوەکان .

وە نیعمەتەکانی بەهەشت هەرگیز لاناچن و بەردەوامن هەتاهەتایە لە خۆشی و خۆشگوزەرانیدان .

وە هاوسەرەکانیان لە حۆریە چاو گەشەکانن؛ نامرن، و لێیان کەم نابێتەوە - واتە لە جوانیەکەیان، واللە اعلم - , وە پیر نابن، وە بەر و بووم و نیعەمەتەکانی بەهەشت نابڕێنەوە، هەروەکو اللە عز و جل فەرموویەتی : ﴿أُكُلُهَا دَائِمٌ وَظِلُّهَا﴾ [الرعد : ٣٥] .

بەڵام سزای ئاگر : بەردەوامە بە بەردەوامی اللە، وە ئەهلەکەی تێیدا نەمرن و هەتاهەتایە تێیدا دەمێننەوە : کە کەسانێکن لە دونیا دەرچوونە و لە بیروباوەڕیدا تەوحیدیان نەبووە، و دەستیان بە سوننەتیش نەگرووە .

ئەمما یەکخواپەرستان : بە شەفاعەت لێی دێنە دەر - مەبەستی ئەو موسڵمانانەیە کە بە هۆی تاوانی گەورەوە چونەتە ئاگرەوە - .

**٢٧٥** - وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (شەفاعەتەکەم بۆ ئەهلی تاوانە گەورەکانە لە ئوممەتەکەم) .

**٢٧٦** - پاشان ئیمان هێنان بە مەلائیکە، وە بەوەی کە جبریل ئەمینی اللە یە و دەینێرێ بۆ پێغەمبەران .

وە ئیمان هێنان بە مەلائیکە : واجب و فەرز کراوە .

**٢٧٧** - بە هەمان شێوە واجب بوونی ئیمان هێنان و بە ڕاست دانانی هەموو ئەوەی پێغەمبەران پێی هاتوون لە لایەن اللە ـوە، وە بە هەموو ئەوەی کە اللە عز و جل فەرموویەتی ڕاستیەکی پێویستە .

جا ئەگەر پیاوێك ئیمانی هێنا بە هەموو ئەوەی کە پێغەمبەران پێی هاتوون لە لای اللە ـوە، وە بە هەموو ئەوەی جبریل علیه السلام پێی هاتووە لای اللە ـوە تەنیا ئیمانی بە یەك شت نەهێنا؛ ئەوا بە ڕەتکردنەوەی ئەو شتە کافر بووە لای هەموو زانایان .

**٢٧٨** - پاشان ئیمان هێنان بەوەی کە اللە عز و جل جنی دروست کردووە و ئەوان دروست کراوانێکن لە دروستکراوەکانی اللە، بەو شێوەیەی کە ویستی لێ هەبووە

دروستی کردون وه بۆ هەر مەبەستێکیش کە ویستی لێبووبێت، وە لە ناویاندا ئیماندار و کافر بوونی هەیە، بەمە الله لە کتێبەکەیدا پێی ڕاگەیاندووین، وە پێغەمبەرانیش پێی هاتوون .

هەروەها ئیبلیسی دروست کردووە کە ئەو سەرۆکی سەربازە شەیتانەکانە، وە ئەو نەوەی ئادەم گومڕا دەکات، و وەسوەسە دەخاتە سینەیانەوە، وە تووشی فیتنەیان دەکات، وە ناشرینیان لەلا باش و جوان دەکات، وە بانگیان دەکات بۆ سەرپێچی کردنی پەروەردگاریان عز و جل، وە ئەو دوژمنیانە و بە ناویاندا دەڕوات هەر وەکو چۆن خوێن بەناویاندا دەڕوات، فێڵەکانی زیان لەوانە نادات کە پشتییان بە الله بەستووە.

جا هەر کەس ئینکاری کرد لە مەسەلەی جن، و بوونی ئیبلیس و شەیتانەکان و لە سنور دەرچووەکان، و گومڕاکردنی بەنی ئادەم؛ ئەوا کافرە بە الله، نکۆڵیکەرە بە ئایەتەکانی، بە درۆخەرەوەی کتێبەکەشییەتی .

**٢٧٩** - پاشان ئیمان هێنان و قبوڵ کردن و بە ڕاست دانانی هەموو ئەوانەی کە زانایان گێڕاویانەتەوە، وە ئەوانەی کەسانی متمانەپێکراو و ئەهلی ئاثار لە رسول الله ﷺ نەقڵیان کردووە، و بە قبوڵ کردن وەریان گرتووە .

ڕەت ناکرێنەوە بە خیلافیان، و ناوترێ : بۆچی؟ و چۆن؟

وە بە عەقڵ لێك نادرێنەوە، وە قیاسیان بۆ ناکرێ، وە تەفسیر ناکرێن؛ ئیللا بەوە نەبێ کە رسول الله ﷺ یان پیاوێك لە زانایانی ئوممەت تەفسیری بۆیان کردووە لەو زانایانەی کە وتەکانیان شیفا و بەڵگەیە .

وەکو : فەرموودەکانی صیفات، و بینین - واتە بینینی اللە - .

## وە نمونەی ئەوانە کە گێڕدراونەتەوە :

**٢٨٠** - (اللە عز و جل ئاسمانەکان لەسەر پەنجەیەك دادەنێ، و زەوییەکان لەسەر پەنجەیەك دادەنێ) .

**٢٨١** - وە (اللە عز و جل پێی لە ناو ئاگری دۆزەخ دادەنێ، جا دۆزەخ دەڵێت : بەسمە بەسمە) .

**٢٨٢** - وە (دڵی بەندەکان لە نێوان دوو پەنجەیە لە پەنجەکانی الرحمن) .

**٢٨٣** - وە (وە اللە عز و جل لەسەر عەرشە، وە عەرش دەنگێکی هەیە وەکو دەنگی بارهەڵگرێکی نوێ) .

**٢٨٤** - وە (اللە عز و جل بە دەستی ڕاستی نەوەیەکی لە پشتی ئادەم دەرهێنا، وە هەردوو دەستی ڕاست و پیرۆزن، وە فەرمووی : ئەمەیان بۆ ئێرە وە باکیشم پێی نییە - واتە بەشێکی بۆ دۆزەخ دیاری کرد - ) .

**٢٨٥** - وە (ڕووخسار بێزراو ناکرێت؛ چونکە اللە ئادەمی لەسەر وێنەی خۆی دروست کردووە) .

**٢٨٦** - وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (پەروەردگارمم بینی لەسەر وێنەی . . ) بەم شێوەیە .

ئەم فەرموودانە متمانەپێکراوان لە هاوەڵان، و بەڕێزەکان لە زانایانی دوای خۆیان گێڕاویانەتەوە؛ وەکو : ابن عمر، و عائشة، و ابي هريرة، و ابن عباس، و جرير بن عبدالله، و انس بن مالك و جگە لەوان رضي الله عنهم .

**٢٨٧** - وە (الله تبارك و تعالى هەموو شەوێك دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا) .

بە هیچ کام لەمانە ناوترێ : چۆن؟ و بۆچی؟ بەڵکو تەسلیم بوونە بۆ قودرەتەکەی، و ئیمان هێنانە بە غەیب، هەر کاتێك عەقڵ دەستەوەستان بوو لە زانینی؛ ئەوا زانست پێی، و خودی ڕێنمونی دەربارەی ئەمە بریتیە لە : ئیمان هێنان پێی، و تەسلیم بوون بۆی، و بە ڕاست خستەوەی رسول الله ﷺ لەوەدا کە فەرموویەتی، ئەمە بنچینەی زانست، و خودی هیدایەتە، ئەم فەرموودانە و هاوشێوەکانیان قیاس ناکرێن، و ڕەد ناکرێنەوە بە نمونە هێنانەوە و بیردۆزەکان - واتە بە فەلسەفە، والله اعلم - .

**٢٨٨** - پاشان ئیمان هێنان بەوەی کە عیسى بن مريم عليه السلام لە ئاسمانەوە دادەبەزێت بۆ زەوی؛ پاشان خاچ دەشکێنێ، و بەراز دەکوژێت، و بانگەوازیش دەبێت بە یەك دانە .

**٢٨٩** - وە لە کۆتایی ئەم ئوممەتەدا دەجال دێتە دەرەوە بە بێ هیچ گومانێك، یەکێك لە چاوەکانی وەکو بڵێی دەنکە ترێیەکی تەقیوە، وە بە هەموو زەویدا دەگەڕێت جگە لە مەککە و مەدینە .

وە عيسى بن مريم عليه السلام دەیکوژێ لە لای دەرگای ڕۆژهەڵاتی لُدّ لە زەوی فلسطين، کە دووریەکەی بە ئەندازەی میلێکە لە الرملة ـوە - الرملة شارێکە لە فلسطين - .

**٢٩٠** - پاشان ئیمان هێنان به ملك الموت علیه السلام، وه بەوەی کە ڕۆحەکان دەکێشێت، پاشان دەنێردرێنەوە بۆ لاشەکان لە گۆڕەکاندا .

**٢٩١** - وە ئیمان هێنان بە فووکردن بە شەیپووڕدا؛ وە شەیپووڕ : شاخێکە ئیسرافیل علیه السلام فووی پێدا دەکات .

**٢٩٢** - وە الله جل جلاله قسەی لەگەڵ موسی کردووە بە قسەکردنێکی ڕاستەوخۆ، وە إبراهیم یشی کردووە بە دۆست و خۆشەویستی خۆی .

**٢٩٣** - وە عیسی بن مریم : ڕووحی الله، و وشەیەتی، بە ڕاستی مردووی زیندوو کردۆتەوە، و کوێری زکماك و بەڵەکی چاك کردۆتەوە، و لە قوڕ باڵندەی دروست کردووە، هەموو ئەمانە بە قودرەتی الله عز و جل، و ویست و ئیرادەی ئەو بووە .

---

: ڕوح لە سیفەتی الله نییە بەڵکو وەکو تەشریفێك خستویەتیە پاڵ خۆی وەک چۆن بە کەعبە ئەوترێت ماڵی الله،واتە وەکو ڕێزلێنان هەندێک شتی داوەتە پاڵ خۆی، وە کە دەڵێ وشەیەتی واتە کە الله فەرموویەتی کُن واتە ببە، ئەویش دروست بووە، وە مانای هەردووکیان بریتیە لەوەی : کە ڕوحێکە بە وشەی الله، الله دروستی کردووە .

**٢٩٤** - وە ئیمان هێنان بەوەی کە الله عز و جل ئادەمی بە دەستی خۆی دروست کردووە، وە بە دەستی خۆی بەهەشتی فیردەوسی ڕوواندووە .

**٢٩٥** - وه ئەوەی کە گێڕدراوەتەوە : (ئەی نەوەی ئادەم، لە نەفسی خۆتدا یادم بکە، لە نەفسی خۆمدا یادت دەکەم، وە لە ناو کەسانێك یادم بکە، لە ناو کەسانێك یادت دەکەم کە باشترن لەو کەسانەی تۆ منت تێدا یاد کرد) .

**٢٩٦** - وە ئەوەی گێڕدراوەتەوە : (هەر کەس بە بستێك لێم نزیك بۆوە ئەوا من بە قۆڵێك لێی نزیك دەبمەوە، وە هەر کەس بە قۆڵێك لێم نزیك بێتەوە ئەوا من بە باعێك لێی نزیك دەبمەوە، وە هەر کەس بە ڕۆشتن بێتە لام من بە هەروەلە دەچم بۆ لای) .

---

: ئەم دوو فەرموودەیەی **٢٩٥** و **٢٩٦** فەرموودەی قودسین، واتە لەفزەکەشی هی الله یە، جا باعێك بریتیە لەوەی کە کەسێك هەردوو باڵی بە تەواوی بکاتەوە لە نوکی دەستی ڕاستیەوە تا نوکی دەستی چەپی دەکاتە باعێك، هەروەها هەروەلە جۆرە ڕۆشتنێکە کە لە ڕۆشتنی ئاسایی خێراترە و لە ڕاکردنیش هێواشترە، والله اعلم .

**٢٩٧** - وە (پەروەردگارت سەرسام بووە بە گەنجێك کە مەیلی بۆ شەهوەت و سەرپێچی نەبێت) .

---

: سەرسام بوون دوو جۆرە : یان ئەوەتا کەسێك شتێکی نەزانیوە کە شتەکە ڕوو بدات ئەوا پێی سەیرە ڕوو دەدات، جا سەرسام بوون بەم واتایە بۆ الله جێگیر ناکرێ و نەفی دەکرێ چونکە الله هەموو شت دەزانێ لە پێش ڕوودانی و دوای ڕوودانیشی، ئەوەی جێگیر دەکرێ ئەوەیە کە الله خۆشی دەوێ بۆیە پێی سەرسامە، والله اعلم .

**٢٩٨** - وه فەرمایشتی ﷺ : (پەروەردگارمان پێکەنی بۆ بێ ئومێد بوونی بەندەکانی و نزیك بوونەوەی گۆڕینی حاڵەتی) .

وه فەرمایشتی : هەرگیز بێ ئومێد نابین لە پەروەردگارێك كە بە چاكە پێ بكەنێ .

---

: مەبەست لەم فەرمایشتە ئەوەیە كاتێك بەندەكانی الله بێ ئومێد دەبن كەچی گۆڕینی بارودۆخەكەیان بۆ باشتر نزیكە، جا الله تعالى بەوە پێدەكەنێ، والله اعلم .

**٢٩٩** - وه فەرمایشتی ﷺ : (جنێو بە زەمانە مەدەن؛ چونكە الله زەمانەیە) .

---

: واتە زەمانە هەڵدەسوڕێنێ و بە دەست خۆیەتی .

**٣٠٠** - وه (نێوان ئاسمان و زەوی پێنج سەد ساڵ ڕێیە، وه ئەستوری هەر ئاسمانێك بە هەمان شێوەیە، وه نێوان ئاسمانێك بۆ ئاسمانێكی دیكە بە هەمان شێوەیە) .

جا هەموو ئەم فەرموودانە، و هاوشێوەكانیان : بەڕێ دەكرێن هەروەكو ئەوەی كە هاتوون، و بە گژ یەكدا ناكرێن، وه نمونەیان بۆ ناهێنرێتەوە، وه مەوزوعی بۆ ناكرێتەوە - واتە ڕێگە بە مونازەرە كردن ناكرێ تێیدا، والله اعلم - .

چونكه زانايان گێڕاویانەتەوە، وە گەورەكان لەوان بە قبوڵ كردن وەریان گرتووە، وە وازیان لە پرسیاركردن لە تەفسیری - واتە چۆنیەتیەكەی - ئەم فەرموودانە هێناوە، وە پێیان وابووە زانست لە : واز هێنانە لە قسە كردن لە واتاكانیاندا - واتە لە چۆنیەتیەكەی واز بهێنرێن - .

**٣٠١** - پاشان ئیمان هێنان بەوەی كە قورئان پارێزراوە لە سینگی پیاواندا .

وە هەر كەس قورئانی لەبەر كرد ناوی لێ دەنرێ : هەڵگری كتێبی الله عز و جل .

**٣٠٢** - وە رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (ئەو پیاوەی كە لە ناخیدا هیچ شتێك لە قورئان بوونی نییە؛ وەكو ماڵێكی ڕووخاو وایە) .

**٣٠٣** - وە فەرموویەتی ﷺ : (با ئەم موصحەفە هەڵواسراوانە فریوتان نەدەن؛ چونكە الله عز و جل دڵێك سزا نادات بە ئاگر كە قورئانی تێدا بێت) .

---

: ئەم فەرموودەیە موقوفە بۆ هاوەڵی بەڕێز ابو امامة بە سەنەدێكی صحیح .

**٣٠٤** - وە دان نان بە فەرموودەی موسى لەگەڵ ملك الموت علیهما السلام، وە ئەوەش كە موسى لێیداوە .

وە هیچ كەس فەرموودەیەكی گێڕدراوە دەربارەی ئەمە ڕەت ناكاتەوە، و كەس ئینكاری لێ ناكات مەگەر موبتەدیعێكی بۆچوون لاواز نەبێت .

زانایان ئەمەیان وتووە دەربارەی ئەو کەسەی کە ڕەتی کردووەتەوە، و لێی وەستاوە.

---

: مەبەستی فەرموودەی ابي هريرة يە رضي الله عنه : كە پێغەمبەر ﷺ فەرموويەتی : (ملك الموت هات بۆ لای موسی، پێی وت : وەڵامی پەروەردگارت بدەوە . فەرمووی : جا موسی لە چاوی ملك الموت ی دا . . .) **رواه البخاري (٣٤٠٧)**.

**٣٠٥** - وە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ کە : (هیچ کەسێك نییە ئیللا سپێردراوە بە هاوشێوەکەی خۆی لە جن) .

وتیان : تۆش یا رسول الله ﷺ ؟

فەرمووی : (وە منیش مەگەر ئەوە نەبێ کە الله عز و جل بەسەریدا سەری خستم و موسڵمان بوو؛ بۆیە فەرمانم پێ ناکات مەگەر بە خێر نەبێت) .

**٣٠٦** - وە پێغەمبەرمان ﷺ یەکەم کەسە لە پێغەمبەران کە دروستکراوە، وە کۆتا دانەیانە کە نێردراوە .

وە دایکی کە پێغەمبەری بووە ﷺ نوورێکی بینیوە کە کۆشکەکانی شامی ڕووناک کردووەتەوە .

**٣٠٧** - وه هەر كەس پێی وابێ كە ئەو ﷺ لەسەر دینی قەومەكەی بووە پێش ئەوەی وەحی بۆ بنێردرێ؛ ئەوا گەورەترین درۆی هەڵبەستووە لەسەر رسول الله ﷺ ، وە ئەوەی كە ئەم قسەیە بكات قسەی لەگەڵ ناكرێ، و لەگەڵیشی دانانیشێنرێ .

---

: واتە نابێ بوترێ كە پێغەمبەر ﷺ بت پەرست بووە پێش ئەوەی بكرێت بە پێغەمبەر .

**٣٠٨** - وه دەڵێین : پێغەمبەرمان ﷺ بە خەتەنەكراوی و ناوكە پەتك بڕاوی لە دایك بووە .

---

ئەم وتەیە **ابن القیم** و **ابن الكثیر** بە ضعیف دایان ناوە البیهقي دەیگێڕێتەوە لە (**دلائل النبوة - ١١٤/١**) كە عباس بن عبدالمطلب فەرموویەتی : رسول الله ﷺ بە خەتەنەكراوی و ناوكە پەتك بڕدراوی لە دایك بووە، فەرمووی : ئەمە عبدالمطلب ی سەرسام كرد .

**٣٠٩** - وه پشتەوەی خۆی دەبینی هەروەكو چۆن پێشی دەبینی .

---

: واتە بە بێ ئاوڕدانەوە پشتەوەی خۆی دیوە هەروەكو لە (**صحیح البخاري - ٧٤٢**) هاتووە كە خۆی ﷺ دەفەرموێ : (ئایا ڕووگەكەی من دەبینن لەوێدا، والله ڕكوعتان و ملكەچیتان لە من شاراوە نییە، وە من لە پشتی خۆمەوە دەتان بینم) .

**٣١٠** - وه ئەو ﷺ سواری البراق - ئاژەڵە باڵدارەکە - بووه، وه چووه بۆ بیت المقدس لەو شەوەدا، پاشان بەرزکرایەوه بۆ ئاسمان، تا لە پەروەردگاری نزیك بووه و پەروەردگاری هاتە خوارەوه، جا ماوەی نێوان دوو کەوان یان کەمتریان لە نێوان دابووه.

---

: والله اعلم، ماوەی نێوان دوو کەوان یان کەمتر دیاره دەستەواژەیەك بووه لە لای عەرەب بەکارهاتووه بۆ ئەوەی دەری برِن کە دوو شت لە یەکەوه زۆر نزیکن، جا ئەم نزیك بوونەوه (دَنا) و هاتنە خوارەوەیه (تَدَلَّى) ئەوه نییە کە لە سورِەتی النجم هاتووه چونکە ئەوەی لەوێ هاتووه سیفەتی جبریل ە و مخلوقە بەڵام ئەمە سیفەتی الله یە و مخلوق نییە، هەر وەکو **ابو العوانة** لە کتێبەکەی خۆی (**مسند** - **١٣٢/١**) چەند دەروازەیەکی داناوه لە رەددانەوەی جەهمیەکان، و رِونکردنەوەی ئەوەی کە بەهەشت دروستکراوه، و پێغەمبەر ﷺ چووەتە ناوی، وه ئەو لەسەرووی ئاسمانەکانە، وه السدرة المنتهى لە سەرووی ئەوەوەیە، وه الله لە سەرووی السدرة المنتهى وەیە و پێغەمبەریش ﷺ گەیشتە ئەوێ، جا لە پەروەردگاری عیزەت نزیك بووەوه و پەروەردگاری عیزەتیش لەو نزیك بووەوه هەتا ماوەی نێوان دوو کەوان یان کەمتر لە نێوانیان بوو، . . .

هەروەها رِووداوی الإسراء و معراج بە خەون نەبووه [وەکو ئەوەی بەشێك لە ئەهلی کەلام ئەیڵێن] بەڵکو بە حەقیقەت پێغەمبەر ﷺ براوه بۆ السدرة المنتهى، هەروەکو **الآجري** لە (**الشريعة - باب ٩٤**) دەڵێ : الله عز و جل شەورِەوی بە محمد ﷺ کرد بە جەستە و بە عەقڵیشی، نەك ئەوەی ئەو شەورِەوییە بە خەون بووبێت، خۆ ئەگەر پێغەمبەر ﷺ بە ابو جهل و باقی قەومەکەی بوتایە : لە خەونمدا وەکو بڵێی لە بیت المقدس بووم ئەگەر ئەمەی لە رِووی خەونەوه بوتایە ئەوانیش قبوڵیان دەکرد، و لە قسەکەی سەرسام نەدەبوون .. جا هەموو ئەمە بەڵگەن بۆ ئەو کەسەی کە عەقڵی کار بکا و جیای بکاتەوه دەزانێت کە الله عز و جل پێغەمبەرەکەی ﷺ تایبەت کردووه بەوەی شەورِەوی بە جەستە و عەقڵی کردووه .. جا هەر کەس پێی وابێ کە لە خەوندا بووه ئەوا : هەڵەی کردووه لە قسەکانیدا، وه کەمتەرخەمی کردووه لە

حەقی پێغەمبەرەکەی ﷺ ، وە قورئان و سوننەتی ڕەت کردووەتەوە و دژی شتێکی مەزن وەستاوە، و باللە التوفیق .

**٣١١** - وە الله عز و جل دەستی خستووەتە نێوان شانەکانی پێغەمبەر ﷺ، جا پێغەمبەر ﷺ هەستی بە ساردییەکەی کردووە لە نێوان سینگیدا؛ پاشان زانستی سەرەتا و کۆتاکان فێر بوو .

**٣١٢** - وە ڕۆژی قیامەت دێت و ئەو ﷺ لە بەرێزترینی پێغەمبەرانە لە پلە و پایەدا، وە بەرزترینیانە لە شوێن و مەنزڵگەدا، و نزیکترینیانە لە الله ـوە عز و جل، و خۆشەویسترینیانە بۆی؛ جا شەفاعەت دەکات و شەفاعەتیشی قبوڵە، و داوا دەکات و پێی دەبەخشرێت .

**٣١٣** - وە ئەو ﷺ دادەنیشێت لەسەر عەرش لەگەڵ پەروەردگاریدا، و ئەمەش بۆ هیچ کەسێك نییە جگە لە خۆی؛ نافع بەم شێوەیە گێڕاویەتیەوە، لە ابن عمر ـەوە رضي الله عنهما، لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەربارەی فەرمایشتی الله کە دەفەرموێ : ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء : ٧٩]، فەرمووی : لەگەڵ خۆی لەسەر عەرش دایدەنیشێنێت .

**٣١٤** - وە هەر بەم شێوەیە مجاهد تەفسیری کردووە لەو ڕیوایەتەی کە محمد بن الفضيل دەیگێڕێتەوە، لە لیث ـەوە، لە ئەوەوە .

: له ئەوەوە واتە لە مجاهد ەوە، **ابن تيمية** لە (**درء التعارض - ٢٣٧/٥**) دەڵێ : هەندێك كەس ئەم ئەثەرەیان گێڕاوەتەوە لە زۆر ڕێگای جیاوازەوە، جا هەموویان موضوع ن، بەڵام ئەوەی جێگیرە ئەوەیە كە لە مجاهد و جگە لەوەوەیە لە سەلەف .

وە دەبینین **الضلال** لە (**السنة**) بابێكی تایبەت كردووە بەم فەزیلەتەی پێغەمبەرەوە ﷺ ، بەڵام كەسانێكی جاهل و نەزان كە دوژمنیان فەرمودە و ئاثارە هاتوون دەڵێن :ئەمە هەڵبەستراوە و شیركە چونكە پێغەمبەر ﷺ چۆن ئەبێ بهێنینە پاڵ الله!!

پەنا بە الله لەم عەقیدە پیسە، چونكە تۆ ناچار دەبی هەموو زانایانی سەلەف و خەلەف تەكفیر كەی ئەگەر ئەمە بە شیرك بزانی، هەروەها جەهمییەكانی ئەو كاتیش كە ئەمەیان ڕەت دەكردەوە نەیان دەوت شیركە بەڵكو بۆیە ڕەتیان دەكردەوە چونكە لایان وابوو كە الله لەسەر عەرش نییە جا چۆن دەكرێ پێغەمبەریش ﷺ بهێنێتە سەر عەرش، ئەمە فەزیلەتێكە و هیچ كێشەیەكی تێدا نییە چونكە هەم عەرش و هەم پێغەمبەر ﷺ مەخلوقن و جا مەخلوقێكە و دەخرێتە سەر مەخلوقێكی دیكە، هەروەها دژیەك نییە لەگەڵ ئەوەی كە بە شەفاعەت تەفسیر كراوە، بەڵكو هەم دانیشتنێتی لەسەر عەرش و هەم شەفاعەتیشە، والله اعلم .

**٣١٥** - پاشان ئیمان هێنان و زانینی ئەوەی كە چاكترین دروستكراو و باشترینیان، و گەورەترینیان لە ڕووی پلە و پایەوە لای الله عز و جل لە دوای پێغەمبەران و نێردراوان، و شایستەترینیان بە جێنشینایەتی رسول الله ﷺ بریتیە لە : ابو بكر الصديق رضي الله عنه؛ عبدالله بن عثمان، وە ئەو عتیق بن ابي قحافة یە رضي الله عنهما - عبدالله بن عثمان ناوی ڕاستەقینەی امام ابو بكر ە، هەروەها عتیق واتە ڕزگار كراو كە رسول الله ﷺ پێی فەرموو : (تۆ ڕزگار كراوی الله یت لە ئاگر) رواه الترمذي (٣٦٧٩) جا لەو ڕۆژەوە ناونرا عتیق - .

وه زانینی ئەوەی کە ئەو ڕۆژەی رسول الله ﷺ وەفاتی کرد هیچ کەس جگە لەو بوونی نەبوو لەسەر ڕووی زەوی کە خاوەنی ئەم وەسفە بێ کە لە پێشترەوە باسمان کرد رحمة الله علیه .

پاشان لە دوای ئەو لەسەر بنچینەی ئەم ڕیزبەندی و وەسفە : ابو حفص عمر بن الخطاب ە رضي الله عنه، وە ئەو الفاروق ە .

پاشان لە دوای هەردووکیان لەسەر بنچینەی ئەم ڕیزبەندی و وەسفە : عثمان بن عفان ە رضي الله عنه، کە ئەو ابو عبدالله، و ابو عمرو و ذو النورین ە - ذو النورین واتە خاوەنی دوو نوورەکە، چونکە دوو کچی پێغەمبەری ﷺ هاوسەری بوونە، بەڵام یەکێکیان وەفاتی کردووە ئینجا ئەوی تری مێناوە چونکە دوو خوشك بەیەکەوە دروست نییە هاوسەرت بن - .

پاشان لەسەر بنچینەی ئەم وەسف و سیفەتە لە دوای ئەوان : ابو الحسن، علي بن ابي طالب ە رضي الله عنه، وە ئەو الأنزع البطين ە، و زاوای رسول الله یە ﷺ، و ئامۆزای خاتم النبيين ە، سەڵاوات و ڕەحمەت و بەرەکەتی الله لە هەر هەموویان بێت - الأنزع البطين نازوێکی امام علي بووە، جا هەندێك لە ڕووی زمانەوانیەوە لێکیان داوەتەوە، بەڵام واتا ڕاستەکەی ئەوەیە کە دوورە لە شرك، والله اعلم بالصواب - .

جا بە خۆشویستنیان و زانینی فەزڵیان : دین ڕاوەستاوە، و سوننەتیش تەواو بووە - واتە خۆشت نەوێن لە ئەهلی سوننە نیت - ، وە حوججەش جێگیر بووە .

**٣١٦** - وە السفيان الثوري رحمە الله وتی : جنێو بە سەلەف مەدە؛ و بە سەلامەتی بچۆرە بەهەشتەوە .

**٣١٧** - وه شاهێدی دەدەیت بە بەهەشت بۆ دە کەس بە بێ گومان، و جیاکاری؛ کە ئەوان هاوەڵانی کێوی حراء ن : پێغەمبەر ﷺ، و ابو بکر، و عمر، و عثمان، و علي، و طلحة، و الزبير، و سعد - بن ابي وقاص - ، و سعيد - بن زيد - ، و عبدالرحمن بن عوف، و ابو عبيدة الجراح .

جا ئەمانە هیچ کەسێك پێشیان ناکەوێت لە فەزڵ و باشیدا .

**٣١٨** - وە شاهێدی بەهەشت دەدەی بۆ هەر کەسێك کە پێغەمبەر ﷺ شاهێدی بۆ داوە .

وە ئەوەش کە حمزة : گەورەی شەهیدەکانە .

وە جعفر الطيار - برای امام علي - : لە بە هەشتدایە .

وە الحسن و الحسين : گەورەی گەنجانی ئەهلی بەهەشتن .

---

: هەموو ئەم فەزیلەتانە بە فەرموودەی صحیح هاتوون، جا جعفر بن ابي طالب بۆیە ناو نراوە الطيار (واتە فڕیو یان باڵدار)، چونکە لە شەڕی مؤتە دا هەردوو قۆڵی بڕدرایەوە، بۆیە الله لە بەهەشت دوو باڵی پێ دەبەخشێ .

**٣١٩** - وە شاهێدی بۆ هەموو کۆچکاران و پشتیوانان دەدەی بە بەهەشت و ڕەزامەندی الله، و تەوبە و ڕەحمەت لە الله وە بۆیان .

---

: مەبەستی ئەو ئایەتەی الله یە کە دەفەرموێ : ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾ [التوبة : ١٠٠] .

**٣٢٠** - وە عیلمت جێگیر بێ، و دڵت دڵنیا بێ لەوەی : هەر پیاوێك کە پێغەمبەری ﷺ دیبێت و شایەتی پێدابێ، و ئیمانی پێ هێنابێ، و شوێنی کەوتبێ تەنانەت ئەگەر یەك کاتژمێر بووبێت لە ڕۆژدا ئەوا باشترە لەو کەسەی کە نەیدیوە، ئەگەر چی هەموو کردەوەی دروست کراوەکانیشی ئەنجام دابێ .

**٣٢١** - پاشان ڕەحمەت ناردن بۆ هەموو هاوەڵانی رضي الله عنهم : بچوك و گەورەیان، و سەرەتا و کۆتایان، وە باسکردنی باشییەکانیان، و بڵاو کردنەوەی فەزیلەتەکانیان، و پابەندبوون پێیانەوە، وە وەستان لە ئەثەرەکانیان - واتە ئەگەر ئەثەر لەوان هاتبوو کیفایەتە بۆمان - , وە حەق لە هەموو ئەوەدایە کە ئەوان فەرموویانە، و پێکانیش لەوەدایە کە ئەوان کردوویانە .

**٣٢٢** - وە زانایان کۆدەنگیان هەیە و جیاوازیان لە نێواندا نییە لەوەی کە : هیچ کەس لە ئەهلی قیبلە - واتە نوێژخوێنان - تەکفیر ناکرێت بە گوناهـ - واتە بە جگە لە شرك و کوفر - ، وە بە مەعصیەت و سەرپێچی دەری ناکەین لە ئیسلام؛ ئومێدمان بۆ چاکەکار هەیە، و دەترسین لەسەر خراپەکار .

وه لەمەدا وتەی موعتەزیلە ناڵێینەوە؛ چونکە دەڵێن : هەر کەس یەك گوناه ئەنجام بدا لە ماوەی تەمەنیدا، یان هێندەی دەنکە دانەوێڵەیەك ستەم بکات لە ماوەی تەمەنیدا؛ ئەوا کافر بووە .

جا هەر کەس ئەمەی وت : ئەوا گەورەترین درۆی هەڵبەستووە لەسەر الله عز و جل، وه الله ی بەری کردووە لەوەی کە وەسفی خۆی پێکردووە لە : بەزەیی، و میهرەبانی، و چاوپۆشی، و چاکە، لێخۆشبوون، و وەرگرتنی تەوبە - واتە هەر کەس بە گوناه خەڵك تەکفیر بکا الله ی داڕنیوە لەم وەسفانەی کە وەسفی خۆی پێکردووە - .

وە پێی وایە کە پێغەمبەران لە ئادەم، و جگە لەو کافر بوون .

چونکە الله عز و جل دەفەرموێ : ﴿وَعَصَى آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَى﴾ [طه : ١٢١] .

وە الله وەسفی گوناهی پێغەمبەرانی کردووە صلوات الله علیهم لە زۆر شوێنی قورئاندا - پێغەمبەران گوناهی بچوکیان کردووە نەك گەورە - .

هەروەها براکانی یوسف، کە ستەمیان لە براکەیان کرد، و دڵی باوکیان ئێشاند، وە سەرپێچی گەورەکەی خۆیان کرد؛ وە سەرەڕای ئەم شتانەش ئەوان : باش و چاکەکار بوون، وە لە ئەهلی بەهەشتیشن .

وە الله عز و جل ب پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرموو : ﴿لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ﴾ [الفتح : ٢] .

وە الله عز و جل فەرمووی : ﴿عَفَا اللَّهُ عَنْكَ لِمَ أَذِنْتَ لَهُمْ﴾ [التوبة : ٤٣] .

**٣٢٣** - وە لەدوای ئەمە : دەوەستین لە باس کردنی ئەو ناکۆییەی لە نێوان هاوەڵانی رسول الله ﷺ ڕوویداوە؛ چونکە ئەوان چەند دیمەنێکیان لەگەڵیدا دیوە، و پێشی خەڵکی کەوتوون لە فەزڵدا، جا الله لێیان خۆش بووە، و فەرمانی بە داوای لێخۆشبوون بۆ ئەوان پێکردوویت، وە نزیك بوونەوە لێی بە خۆشویستنیان، وە ئەمەی لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرز کردووە، و ئەو دەیزانی کە چی دەکەن، و دەیزانی ئەوان بەشەڕ دێن، کەچی ئەوان فەزڵیان پێدرا بەسەر باقی دروستکراوەکاندا؛ لەبەر ئەوەی کە هەڵەی غەیر ئەنقەست و هەڵەی ئەنقەستیش لە ناکۆکیەکانیانەوە کەوتۆتەوە و الله ـش لەوانەیان خۆش بووە - واتە الله دەیزانی کە ئەوان ناکۆکیان تێ دەکەوێ و لە ناکۆکیشیان خۆش بووە جا لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرمانی پێکردووین کە خۆشمان بوێن و داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەین - .

وە سەیری کتێبی : صفين، و الجمل، و وقعة الدار، و باقی ناکۆییەکانی نێوانیان ناکرێت - ئەو ناوانە ناوی شەڕەکانی نێوان هاوەڵانە - .

وە بۆ نەفسی خۆت، و غەیری خۆتی مەنوسەوە، و لە هیچ کەس مەیگێڕەوە، و بەسەر هیچ کەسیشدا مەیخوێنەوە، و گوێ بۆ ئەوەش مەگرە کە دەیگێڕێتەوە .

چونکە زانا بەڕێزەکانی ئەم ئوممەتە لەسەر ئەم نەهی کردنەی کە باسمان کرد و وەسفمان کرد ڕێککەوتوون؛ لەوانە : حماد بن زيد، و يونس بن عبيد، و سفيان الثوري، و و سفيان بن عيينة، و عبدالله بن ادريس، و مالك بن انس، ابن ابي ذئب، و ابن المنكدر، و ابن المبارك، و شعيب بن حرب، و ابو اسحاق الفزاري، و يوسف بن اسباط، و احمد بن حنبل، بشر بن الحارث، و عبدالوهاب الوراق .

هەموو ئەوانە بۆچوونیان نەهی کردن بووە لێی، و لە سەیرکردنی، و گوێ لێگرتنی، وە ئاگاداریان داوە لە بە دوا گەڕانی، و گرنگی پێدان بە کۆکردنەوەیدا .

وە لێیانەوە زۆر شت بە دەربڕینی جیاواز گێڕدراوەتەوە سەبارەت بەو کەسەی ئەم کارانە دەکات، کە هەموویان لە واتادا ڕێك دەکەون لەسەر کەڕاهیەت و ناشرینی ئەم کارە، وە نەهی کردن لەو کەسەی کە ڕیوایەتی دەکات و گوێی لێ دەگرێت .

**٣٢٤** - پاشان لە دوای ئەمە : شاهێدی دەدرێ بۆ عائشة بنت ابي بكر الصديق رضوان الله عليه و عليها کە ڕاستگۆیە، پاکە، بەری کراوە - لەو بومتانەی بۆی هەڵبەسترا - لە ئاسمانەوە لەسەر زمانی جبريل عليه السلام، کە هەواڵێك بووە لە لایەن الله عزوجل، تیلاوەکراوە لە قورئاندا، جێگیرە لە سینگی ئوممەت و مصحەفەکاندا تا ڕۆژی قیامەت؛ کە ئەو هاوسەری رسول الله یە ﷺ، بەریی کراوە، پاکە، باشترینە، فەزڵیشی پێدراوە، وە ئەوەش کە ژنێتی و هاوسەرێتی بەهەشتدا، وە دایکی ئیماندارانە لە دونیا و ئاخیرەتدا. جا هەر کەس گومانی لەمە هەبوو، یان تانەی لێ دا، یان لێی وەستا؛ ئەوە کتێبی اللهی بە درۆ خستۆتەوە، وە گومانی لەوە هەیە کە لە رسول الله وە ﷺ هاتووە، وە پێی وایە ئەمە لە غەیری الله وەیە کە فەرموویەتی : ﴿يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُواْ لِمِثْلِهِۦٓ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ [النور : ١٧] .

جا هەر کەس ئینکاری ئەمە کرد ئەوا بەری بووە لە ئیمان .

**٣٢٥** - وە هەموو هاوەڵانی رسول الله ی ﷺ خۆش دەوێت بە پێی پلە، و مەنزیلەتیان یەکە بە یەکە : لە ئەهلی بەدر، و حودەیبیە، و بەیعەتی رضوان، و ئوحود.

چونکە ئەوانە خاوەن فەزیلەتە شەریفەکان، و پلە و پایە بەرزەکانن، ئەوانەی کە پێشەنگەکان بۆیان پێشکەوتن، رضوان الله علیهم اجمعین .

**٣٢٦** - وە ڕەحمەت بۆ باوکی عبدالرحمن معاوية بن ابي سفيان دەنێریت، کە برای أم حبيبة ی هاوسەری رسول الله ﷺ، خاڵی هەموو ئیمانداران، وە نوسەری وەحییە .

وە باسی فەزڵەکانی و ئەوانەش دەکەی کە لەبارەیەوە لە رسول الله وە ﷺ گێردراوەتەوە، چونکە

**٣٢٧** - ابن عمر رضي الله عنه فەرموویەتی : لەگەڵ رسول الله ﷺ بووین فەرمووی : (لەو دەرگایەوە پیاوێك دێتە ژورەوە لە ئەهلی بەهەشتە)، جا معاوية هات .

بۆیە بزانە کە ئەمە فەزڵ و پلەیەتی .

**٣٢٨** - پاشان ئەو کەسەت خۆش دەوێت لە پێناو الله کە گوێڕایەڵی الله دەکات، تەنانەت ئەگەر لێشت دوور بوو، وە سەرپێچی ویستەکانیشی کردیت .

وە لە پێناو الله ئەو کەسەت ڕق لێیە کە سەرپێچی الله دەکات، و دۆستایەتی دوژمنانی دەکات، ئەگەر چی لێت نزیکیش بێت، و ئارەزووی تۆ و ئەو ڕێك بکەوێت لە دونیادا، جا لەسەر ئەم بنچینەیە سیلەی ڕەحم دەگەیەنیت، یان دەیبچڕێنیت .

---

: رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (بەهێزترین پەتی ئیمان : خۆشویستنە لە پێناو الله، و ڕق لێبوونە لە پێناو الله) [**رواه احمد - ١٨٥٢٤**]، جا ئەمانە هەمووی ڕەددن بۆ ئەو گومڕایانەی کە هەمیشە باسی پێکەوە

ژیانی کافر و موسڵمان دەکەن و دەڵێن ئێمە نابێت ڕقمان لە مرۆڤەکان بێت، بەڵام ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ بە بەهێزترین پەتی ئیمان وەسفی کردووە، وە پچڕاندنی سیلەی ڕەحم لەسەر ئەساسی دین دەبێت نەك دونیا، چونکە ئەگەر لەسەر ئەساسی دونیا بێت لە **٣** ڕۆژ زیاتر نابێت تێپەڕ بێ .

**٣٢٩** - وە هیچ بۆچوونێك دامەهێنە، و گوێ بۆ ئەو کەسەش مەگرە کە دەیڵێت؛ چونکە بۆچوون دەیپێکێ و نایپێکێ .

**٣٣٠** - وە دامەنیشە لەگەڵ هاوەڵانی مشتومڕ و ناکۆکیدا؛ چونکە ئەوان چەواشەکاری لە ئایەتەکانی الله دا دەکەن .

**٣٣١** - وە ئاگاداری مشتومڕ و موجادەلە بە لە ديندا؛ چونکە ئەوە ڕق و کینە جێدەهێڵێ، و خاوەنەکەی ئەگەرچی سوننیش بێت دەریدەهێنێت بۆ بیدعە، لەبەر ئەوەی یەکەم کەم و کورتی لە دیندا کە دەکەوێتە سەر کەسی سوننی کاتێك کە مشتومڕی لەگەڵ بیدعەچیدا کرد :

**أ** - دانیشتنێتی لەگەڵ بیدعەچیدا، و مناقەشە کردنە لەگەڵیدا .

**ب** - پاشان دڵنیا نیت لەوەی کە چی دەچێتە دڵیەوە لە وتەی دیاریکراو، و قسەی قێزەون کە توشی فیتنەی دەکات .

**ج** - یان ئەوەی توشی فیتنەی ناکات؛ جا وای لێ دەکات زۆر لە خۆی بکات و بۆچوونێك بڵێت بۆ ڕەدد دانەوەی وتەکەی ئەو کە ئەو بۆچوونە هیچ ئەسڵێکی نییە بۆ

لێکدانەوە، و بەڵگەیەکی دابەزێنراوی لە پشتەوە نییە، و هیچ ئەثەرێکیش لە هەواڵەکانی رسول الله ﷺ دەربارەی نییە .

---

: واتە یان ئەوەتا قسەی بیدعەچیەکە توشی فیتنەت دەکات، یاخود دەچیت تۆش ڕەئێك دادەهێنیت کە هیچ کەس لە پێش تۆ نەیوتووە تەنها مەبەستت ڕەد دانەوەی قسەی بیدعەچیەکەیە، ئەمەش ئیشی کەسی سوننی نییە قسەیەك بکات کە پێشینی نەیان کردبێ .

**٣٣٢** - پاشان لە دوای ئەمە : وەستان و دانیشتن لە کاتی فیتنەدا - واتە تەداخول مەکە - , وە دەرمەچۆ بە شمشێر لەسەر پێشەوایان ئەگەر چی ستەمیشیان کرد - واتە پێشەوای موسڵمانان - .

**٣٣٣** - وە عمر بن الخطاب رضي الله عنه فەرمووی : ئەگەر ستەمی لێ کردیت ئارام بگرە، و ئەگەر بێ بەشی کردیت ئارام بگرە .

**٣٣٤** - وە پێغەمبەر ﷺ بە ابو ذر ی فەرموو : (ئارام بگرە، ئەگەر چی بەندەیەکی حەبەشیش بێت) .

**٣٣٥** - وە زانایان لە ئەهلی علم، و فقە، دونیانەویستی و خواپەرستی، وە عابیدان، و دونیانەویستان لە سەرەتای ئەم ئوممەتەوە تاکو ئەم کاتەی ئێستامان کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی :

که نوێژی جومعە و دوو جەژنەکە، و مینا، و عەرەفات، و غەزاکان، و حەج و قوربانی حەج : لەگەڵ هەموو کاربەدەستێکی چاکەکار و خراپەکار، و بەخشینی باج و خەراج، و صەدەقەکان پێیان : جائیزە .

وە نوێژکردن لەو مزگەوتە گەورانەی کە دروستیان کردووە، و ڕۆیشتن لەسەر ئەو پرد و جسرانەی دایان ناوە، وە کڕین و فرۆشتن، و باقی بازرگانیەکان، و کشتوکاڵ، و پیشەسازی لە هەموو سەردەمێکدا، لەگەڵ هەموو کاربەدەستێکدا : جائیزە لەسەر بنچینەی حوکمی قورئان و سوننەت .

ستەمی ستەمکار، و زۆرداری زۆردار؛ زیان ناگەیەنێت بەو کەسەی خووی بە دینەکەیەوە گرتووە، و دەستی بە سوننەتی پێغەمبەرەکەیەوە گرتووە ﷺ؛ ئەگەر ئەوەی کرد لەسەر بنچینەی حوکمی قورئان و سوننەت، هەروەکو چۆن ئەگەر کڕین و فرۆشتنی کرد کە پێچەوانەی حوکمی قوئان و سوننەت بوو لە سەردەمی پێشەوایەکی دادپەروەردا ئەوا دادپەروەری پێشەواکە سوودی پێ ناگەیەنێت - واتە ئەگەر کاربەدەست ستەمکار و زۆردار بوو وە تۆ کاری خۆت بکەی بە پێی قورئان و سوننەت ئەوا ستەم و زۆرداریەکەی زیانی بۆت نییە، جا ئەگەر بە پێچەوانەی قورئان و سوننەت کردت و کاربەدەست دادپەروەریش بوو ئەوا دادپەروەریەکەی سودت پێ ناگەیەنێت - .

وە حوکم بردنەوە بۆ لای دادوەرەکانیان، و بەرزکردنەوەی حەددەکان، و قەرەبوو کردنەوەکان، لێسەندنەوەی مافەکان لە ستەمکارەکان بە فەرمان، و مەرجی ئەوانە .

وە گوێگرتن و بە گوێ کردنی ئەو کەسەی کە ئەوان کاریان پێ سپاردووە تەنانەت ئەگەر بەندەیەکی حەبەشیش بێت، مەگەر لە سەرپێچی کردنی الله عز و جل، چونکە

لەمەدا گوێڕایەڵی بۆ دروستکراوەکان نییە - واتە ئەگەر کاربەدەستان فەرمانیان بە سەرپێچی کردنی الله پێکردی نابێت گوێڕایەڵیان بکەیت، وە هەموو ئەمانە بۆ کاربەدەستانی موسڵمانانە نەك کافران . -

**٣٣٦** - پاشان لە دوای ئەمە : بیروباوەڕی دینداری کردن بە ئامۆژگاری کردنی پێشەوایانە، وە باقی ئوممەت لە دین و دونیا، خۆشویستنی خێر بۆ باقی موسڵمانان؛ ئەوەت بۆ ئەوان حەز لێیە کە بۆ خۆتت حەز لێیە، و ڕقت لەوەیە بۆ ئەوان کە بۆ خۆشت ڕقت لێیە .

**٣٣٧** - وە ڕاوێژ مەکە بە هیچ کەس لە ئەهلی بیدەع لە دینەکەتدا، وە لە گەشتتدا هاوەڵێتی مەکە، وە ئەگەر بۆت کرا لە دراوسێیەتیدا لێی نزیك مەبەوە .

**٣٣٨** - وە لە سوننەتە : دوور کەوتنەوە لە هەموو ئەوانەی کە بیروباوەڕیان بە شتێکە لەوەی باسمان کرد - لە بیدعەکان - , وە هەجر کردنی، و ڕق لێبونەوەی، وە هەجر کردنی ئەوەش کە دۆستایەتی ئەوی کرد و سەری خست، و بەرگری لێکرد، و هاوەڵێتی کرد، ئەگەر چی بکەری ئەم کارانە سوونەتیشی نیشان دا .

# بەشی سێیەم

## عیبادەتەکان و ئادابەکان



### وە لە سوننەتە :

**٣٣٩** - بەرزکردنەوەی هەردوو دەست لە نوێژدا لە کاتی : دەست پێکردنی - واتە تەکبیری یەکەم - ، وە لە چوونە ڕکوع، وە ئەو کاتەش کە سەری لە ڕکوع بەرز دەکاتەوە . کە ئەمە زیادەیەکە لە چاکە .

**٣٤٠** - وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (بە هەموو ئاماژەیەك چاکەی بۆ دەنوسرێت) - واتە لە نوێژدا - .

### وە لە سوننەتە :

**٣٤١** - مەسح کردنی جووتە خوف بۆ هەر کەسێك کە دەستنوێژی شکا، و ئەگەر جووتە خوفەکەی لەسەر طهارة لەپێ کردبێ :

ئەگەر گەشتیار بوو : سێ ڕۆژ دەیکات بە شەوەکانیشیەوە، وە ئەگەر نیشتەجێ بوو : ڕۆژێك و شەوێك دەیکات .

جا سوننەتی موسڵمانانی سەرەتا لەسەر ئەمە ڕۆیشتووە، و زانایانی دینیش وەریان گرتووە .

کەس ئینکاری لەمە ناکات و ڕەتی ناکاتەوە مەگەر موبتەدیعێکی ناو خەڵکی نەبێ، کە سەرپێچیکاری پێغەمبەرە ﷺ، پشت هەڵکردووە لە سوننەتەکەی، ڕەتکەرەوەی فەرمایشتەکەیەتی .

---

: خوف وەکو گۆرەوی وایە، ئەگەر لەسەر طهارة واتە بە دەستنوێژەوە لە پێی بکەیت و دواتر کە دەستنوێژت شکا؛ سوننەتە بۆ دەستنوێژ گرتنەوە دایان نەکەنی و قاچت نەشۆی بەڵکو مەسحێکی سەر خوفەکانت بکەیت .

**وە لە سوننەتە** :

**٣٤٢** - پەلەکردن لە بەربانگ کردن، وە دواخستنی پارشێو .

**٣٤٣** - وە زوو ئەنجامدانی نوێژی مەغریب کاتێك خۆر ئاوا بوو، پێش دەرکەوتنی ئەستێرەکان .

**٣٤٤** - چونکە رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (ئوممەتەکەم بەردەوام لە خێر و باشی دان، ئەگەر پەلەیان کرد لە بەربانگ کردن، وە پارشێویان دواخست) .

---

: دواخستنی پارشێو واته هەتاکو پارشێو کردنەکەت نزیك تربێت لە کاتی فجر ەوە خێری زیاترە .

**٣٤٥** - وە فەرمووی ﷺ : (خەڵکی بەردەوام لە خێر و باشیداندن، ئەگەر نوێژی مەغریب دوا نەخەن بۆ کاتی دەرکەوتنی ئەستێرەکان) .

**٣٤٦** - وە سلیمان بن داود وتی : لەگەڵ علي بن ابي طالب رضي الله عنه نوێژی مەغریبم دەکرد و نەمدەزانی خۆر ئاوا بووە، یاخود نا!

**٣٤٧** - وە لە سوننەتە بۆ هەر کەس بیەوێت هاوسەرەکەی تەڵاق بدات : کە تەڵاقی نەدات مەگەر بە یەك تەڵاق دان نەبێت، کاتێك کە لە سووڕی مانگانە پاك دەبێتەوە، وە نەچێتە لای لەو کاتەی پاك بووەتەوە لە سوڕی مانگانە، پاشان لێی بگەڕێت هەتاوەکو عیددە شەرعیەکەی تەواو دەبێت .

جا ئەگەر تەڵاقی دا بە سێ دانە لە یەك لەفزدا و لە یەك پاکبوونەوەدا لە سوڕی مانگانە، یان لەو کاتەدا کە لە سوڕی مانگانەدایە؛ ئەوا تەڵاقی داوە بە تەڵاقدانی بیدعە.

وە ئافرەتەکە بۆی حەڕامە و هەرگیز بۆی حەڵاڵ نییە هەتاوەکو شوو بە پیاوێکی غەیری ئەو نەکاتەوە و مێردەکەی بمرێ، یان تەڵاقی دابێت و چووبێتە لای .

---

: واتە کە پیاو ئافرەت تەڵاق دەدات و عیددەکەی تەواو دەبێ ئەوا ناتوانێ مارەی بکاتەوە هەتاوەکو ئافرەتەکە شوو بە پیاوێکی تر نەکا، جا پیاوەکەی بمرێ یاخود بە ویستی خۆی تەڵاق بدا و پێش تەڵاق دان چووبێتە لای بۆ سەرجێیی، والله اعلم .

## وە لە سوننەتە :

**٣٤٨ -** تەکبیر کردن لەسەر جەنازە بە چوار تەکبیر کردن - واتە نوێژی مردوو چوار الله اکبر ی تێدا بێت - .

**٣٤٩ -** جا ئەگەر ئیمامەکەت زیاتری کرد؛ ئەوا دووبارە لە سوننەتە کە وەکو ئەو بکەی دوای ئەوەی کە پێشت وایە چوار دانەیە. چونکە ابن مسعود رضي الله عنه فەرموویەتی : تەکبیر بکە ئەوەندەی کە ئیمامەکەت تەکبیری کرد .

## وە لە سوننەتە :

**٣٥٠ -** کە ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بە دەنگی بەرز نەخوێنیت .

---

: واتە ئەو نوێژانەی کە قورئان بە دەنگی بەرز تێیاندا دەخوێندرێ وەکو نوێژی مەغریب، ئەوا سوننەتە ئیمامەکە هەر بە دەنگی نزم بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ بخوێنێ .

**٣٥١** - وە قنوت مەکە لە نوێژی بەیانی؛ مەگەر موسڵمانان هێرشیان کرابێتە سەر لە لایەن دوژمنانیانەوە، جا ئەو کات ئیمام قنوت دەکات، تۆش وەکو ئەو دەکەیت.

**٣٥٢** - وە نوێژی وتر ڕکعەتێکی جیایە لەو نوێژەی کە لە پێش خۆیەوە هەیە .

**٣٥٣** - وە قنوت تێیدا لە دوای ڕکوعە - واتە دوای وتنی سمع الله لمن حمد، ربنا و لك الحمد؛ قنوت دەخوێندرێ - .

## وە لە سوننەتە :

**٣٥٤** - کە قامەت تاك بێت .

: بانگدان جووتە وە قامەت تاکە، واتە لە بانگدان بانگبێژ دوو جار ئەڵێت (الله اکبر الله اکبر)، بەڵام لە قامەت قامەتکاری یەک جار ئەڵێت (الله الکبر الله اکبر) .

## وە لە سوننەتە :

**٣٥٥** - کە دوو ڕکعەت نوێژ بکەیت کاتێك چوویتە مزگەوتەوە پێش ئەوەی دابنیشی، ئەگەر دەستنوێژت هەبوو، تەنانەت ئەگەر ڕۆژی جومعەش بوو وە ئیمامیش وتاری دەدا .

## وە لە سوننەتە :

**٣٥٦** - وە لە سوننەتە کە بێدەنگ بی بۆ وتار و دڵی بدەیتێ، وە گوێی لێ بگری .

**٣٥٧** - وە ڕووخسارت ڕووی لە وتارخوێن بێت ئەگەر تۆ لە شوێنێکدا بوویت کەبدەتتوانی بیبینی، ئەگەر نا; بێدەنگ بوون و دڵ پێدان .

**٣٥٨** - چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (هەر کەس وتی : (بەسە - واتە بێدەنگ بە - )، و ئیمامیش لەوکاتەدا وتاری دەدا؛ ئەوا قسەی ناپێویستی کردووە، و هەرکەسیش قسەی نا پێویستی کرد ئەوا جومعەی بۆ نییە) .

**٣٥٩** - وە فەرمووی ﷺ : (هەر کەس قسەی کرد و ئیمامیش وتاری دەدا؛ ئەوا وەکو ئەو گوێدرێژەیە کە بارە کتێبێکی هەڵگرتووە) .

**٣٦٠** - وە فەرمووی ﷺ : (هەر کەس قسەی کرد و ئیمامیش وتاری دەدا؛ ئەوا بەشی ئەو لە جومعە : مشتێك خۆڵە) .

**وە لە سوننەتە :**

**٣٦١** - کە سەلام بکەیت لەوانەی کە دەچیتە ژوورەوە بۆ لایان لە مزگەوتێکدا، یان غەیری ئەو مزگەوتە، وە سەلام بکەیت کاتێك چویتە دەرەوە .

**٣٦٢** - وە هیچ شتێك حەڕام مەکە لەوانەی کە اللە عز و جل حەڵاڵی کردوون،؛ چونکە ئەو کەسەی ئەو کارە دەکات درۆ هەڵبەستە بۆ اللە عز و جل، ڕەتکەرەوەی فەرمایشتیەتی، لە سنور دەرچویەکی ستەمکاریشە .

اللە عز و جل فەرموویەتی : ﴿قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ﴾ [یونس : ٥٩] .

وه له شوێنێکی تردا فەرموویەتی : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ﴾ [المائدة : ٨٧] .

**٣٦٣** - وه الله يەهودییەکانی عەیبدار کرد بەوەی کە گۆشتی حوشتریان حەڕام کرد کە الله بۆ ئەوان، و باقی دروستکراوەکانی حەڵاڵ کردبوو .

هەروەکو الله عز و جل فەرموویەتی : ﴿كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسْرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوْرَىٰةُ قُلْ فَأْتُواْ بِٱلتَّوْرَىٰةِ فَٱتْلُوهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ [آل عمران : ٩٣] .

پاشان فەرمووی : ﴿فَمَنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ [آل عمران : ٩٤] .

**٣٦٤** - دواتر رافضەکان خۆیان چواند بە یەهودییەکان لە حەڕام کردنی ئەوەی کە الله حەڵاڵی کردووە، وە ڕەددی فەرمایشتی الله عز و جل یان دایەوە، وە بوختانیان بۆی هەڵبەست، وە مارماسی و گۆشتی حوشتریان حەڕام کرد .

**٣٦٥** - وە رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (ئەو کەسەی کە ئەو شتە حەڕام دەکات کە الله حەڵاڵی کردووە، وەکو ئەو کەسە وایە شتێك حەڵاڵ دەکات کە الله حەڕامی کردووە) - ابو حاتم دەڵێت فەرموودەیەکی منکر ە - .

جا لەوانەیە زۆرێك لەوانەی کە ئەمانە حەڕام دەکەن و عەیبیان لێ دەگرن : زینا بکەن، و عەرەق بخۆنەوە، و سەروەت و سامانی خەڵکیش بە ستەم ببەن .

وه كەسانێك لە خەڵكی هەن كە ئەم حەڕام كردنەی ئەوان بە ئاسان دەزانن و كارەكەیان بە شتێكی بچوك دادەنێن .

بەڵام ئەمە لای زانایان لە تاوانە گەورە و مەزنەكان، و فاحیشە قێزەونەكانە؛ لەبەر ناكۆكی و موناقەشە لەگەڵ الله، و ڕەتكردنەوەی فەرمایشتەكانی بە حەڕام كردنی ئەوەی كە الله حەڵاڵی كردووە، وە بە تەسك كردنەوە و تەنگ كردنی ئەوەی كە ئەو فراوانی كردووە، وە بە مەنع كردنی ئەوەی كە ئەو ڕێگەی پێداوە، وە بە ڕاستی نیعمەتەكانی بەسەرمانەوە ژماردووە، وە منەتەكانی بەسەرمانەوە هەژمار كردووە لەم فەرمایشتەیدا : ﴿وَهُوَ الَّذِي سَخَّرَ الْبَحْرَ لِتَأْكُلُوا مِنْهُ لَحْمًا طَرِيًّا﴾ [النحل : ١٤] .

**٣٦٦** - وە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی دەریا دەفەرموێ : (ئاوەكەی پاكە و پاككەرەوەیە، وە مردووەكەشی حەڵاڵە) . - واتە ئەو زیندەوەرانەی ناو دەریا بە مردوویش حەڵاڵن - .

وە الله زانیویەتی كە مارماسی لە دەریادایە، جا چۆن نازانێت لە كاتێكتدا خۆی دروستكەریەتی!

وە رسول الله ﷺ زانیویەتی كە مارماسی لە دەریادایە .

ئایا تۆ كەسیان دەبینی جیاكاریان كردبێت لە حەڕام كردنی مارماسی دا ؟! - واتە ئایا لە ئایەتەكە و فەرموودەكەدا دەبینی كە مارماسیان جیا كردبێتەوە وتبێتیان هەموو ئەو زیندەوەرانەی ناو دەریا حەڵاڵە جگە لە مارماسی ؟! - .

وە بەڕاستی الله سەربڕینی حوشتری کردووە بە یەکێك لە گەورەترین ئەو شتانەی کە لە خۆی پێی نزیك دەبیتەوە، و داوای بردنەوە لای الله ی پێ دەکەی، هەروەکو فەرموویەتی : ﴿وَالْبُدْنَ جَعَلْنَاهَا لَكُمْ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ لَكُمْ فِيهَا خَيْرٌ﴾ [الحج : ٣٦] .

وە سزای ئەو کەسەی کە هەتکی حەجەکەی کردووە بە گەورەترین حەرام کراوەکان؛ کە چوونە لای خێزانە لە حەجدا : بریتییە سەربڕینی حوشتر - واتە بۆ پاك بوونەوە لە تاوانی چونە لای خێزان لە حەجدا کە گەورەترین حەرامکراوە لە کاتی حەجدا، دەبێ حوشتر بکاتە قوربانی، والله اعلم - .

**٣٦٧** - وە إسرائيل بن ابي اسحاق وتی : مارماسیەکم برد بۆ ماڵی زيد بن علي رضي الله عنه دواتر سبەینێ بینیمەوە، پێی وتم : ئەو ماسیەم بە دڵ بوو، وە پێم گەیشتووە قەومێك هەن حەڕامی دەکەن، و بانگەشەی حەرام کردنەکەشی بەسەر ئێمەدا دەدەن؛ جا هەر کەس وای وت، یان کردی : لەعنەتی الله ی لێبێ، وە لەعنەتی لەعنەت کارانیشی لێبێ .

**٣٦٨** - وە الحسن بن صالح وتی : بە جعفر بن محمدرضي الله عنه م وت : ئەی کوڕی رسول الله ﷺ، ڕای تۆ چییە سەبارەت بە مارماسی؟

فەرمووی : ئەوە خواردنێکە کە من بە دڵمە، کەم کات هەیە لە دەستم بچێت .

**٣٦٩** - وە ابو الأسامة وتی : ئەو ڕۆژە الأعمش هاتە دەرەوە بۆ لامان، وتی : ئەمڕۆ خواردنێکی خاوێنم خوارد کە شەیتانیش بە خاوێنیەکەی زانیوە، و لەسەر گەمژەکان حەڕامی کردووە .

وتمان : چییە ئەوە ئەی باوکی محمد؟

وتی : گۆشتی مارماسیم خوارد .

**وە لە سوننەتە :**

**٣٧٠** - کە بزانیت ئەوانەی پێغەمبەریان ﷺ بینیوە، و ئەوەیان بە ڕاست خستووەتەوە کە پێشەواکانیان پێی هاتوون : فەزڵیان هەیە لە ترسان لە الله عز و جل، وە لە بە گەورە ڕاگرتنی، و بە شکۆ ڕاگرتنیدا؛ بە هۆی ئەوەی کە دیویانە لە بەڵگەکان .

بە هەمان شێوە ئەهلی ئیمانیش لە بەڕاست خستنەوەدا، هەندێکیان بەرزترن بەسەر هەندێکی تریانەوە .

وە بە هەمان شێوەش بوونی کردەوەکان بە ئەندازەی بوونی زانست و ئیمانە بە الله لە سینەکاندا - والله اعلم، واتە هەتاکو ئیمانت زیاتر بێ بە الله، ئەوا کردەوەشت زیاتر دەبێ - .

وە لە سوننەتە :

**٣٧١** - کە بزانیت متعة - واتە زەواجی صیغە - حەڕامە هەتا ڕۆژی قیامەت .

**٣٧٢** - وە عمر بن الخطاب رضي الله عنه فەرمووی : کەسێکم بۆ نەهێنراوە کە نیکاحی متعة دەکا و زانیبێتی کە حەڕامە ئیللا بەردبارانم کردووە ئەگەر هاوسەری هەبووبێت، یان جەڵدم کردووە ئەگەر سەڵت بووبێت .

**٣٧٣** - وە علي بن ابي طالب رضي الله عنه پیاوێکی بۆ هێنرا کە زەواجی متعة ی کردبوو، فەرمووی : ئەگەر خۆم پێی بگەشتمایە ئەوا بەردبارانم دەکرد .

**٣٧٤** - وە نیکاح بوونی نییە مەگەر بە وەلی و دوو شاهێد نەبێ . وە داواکار : کە ئەو کەسەیە کە زەواج دەکات .

**٣٧٥** - وە عیددە فەرزێکە لە الله عز و جل ەوە بۆ هەموو : تەڵاق دراوێك و مختلعة یەك کە سەرجێییان لەگەڵ کرابێ - مختلعة : واتە ئەوانەی کە بۆ مەبەستی تەڵاق وەرگرتن بەشێك لە مارەییەکەیان دەدەنەوە بە مێردەکانیان، والله اعلم - .

وە بۆ هەموو ئەوانەش کە مێردەکانیان مردوون؛ جا سەرجێییان لەگەڵ کرابێت، یاخود نا .

کەس ئینکاری لە عیددەی ئافرەتان ناکات مەگەر موبتەدیعێکی سەرپێچیکار نەبێ بۆ الله و پێغەمبەرەکەی ﷺ، کە ڕەتکەرەوەی فەرمایشتەکانیان، و کافرن بە کتێبی الله عز و جل .

**وە لە سوننەتە :**

**٣٧٦** - کە شوێنی رسول الله ﷺ بکەویت، وە اقتفاء بە فەرمانەکانی بکەی - واتە بە شوێن فەرمانەکانیدا بڕۆیت و بە گەورەیان بزانی، والله اعلم - , وە پابەند بیت بە ڕێنمونییەکەوەیە، وە کردەوەکانی وەربگریت، وە بە فەرمانەکانی کۆتایی بهێنیت - واتە ئەگەر ئەو فەرمانی لە شتێکدا هەبوو ئەوا فەرمانەکەی کیفایەتە - , وە زۆر گێڕانەوە لێی لە هەموو ئەوەی کە کردوویەتی و بە چاکی داناوە، و بانگەشەی بۆ کردووە، و هانی ئوممەتەکەی داوە لەسەری بۆ ئەوەی خۆیانی پێ پەروەردە بکەن؛ جا بە هۆیەوە ئادابیان جوان دەبێ لە دونیادا، و قەدریشیان لای الله گەورە دەبێ .

وە لەوانەی کە فەرمانی پێکردووە و گێڕانەوەکان لێیەوە بە صحیحی هاتوون :

یادکردنی الله یە عز و جل لە هەموو شوێنەکاندا، وە لە جووڵەکانیشدا، وەکو :

**٣٧٧** - بسم الله کردن لە سەرەتای بە نان خواردندا، وە سوپاس کردنی لە کاتی کۆتاییەکەیدا .

**٣٧٨** - وە بسم الله کردن لە سەرەتای دەستنوێژدا .

**٣٧٩** - وە زیادەڕەوی کردن لە ئاو لە لوت وەرداندا .

---

: ئەمە بۆ کاتێکە کە کەسەکە بەڕۆژوو نەبێت، چونکە ئەگەر بە ڕۆژوو بێت نابێ لە سێ جار زیاتر بکات، هەروەکو فەرموویەتی ﷺ : (وە زیادەڕەوی بکە لە ئاو لە لوت وەرداندا، مەگەر بە ڕۆژوو بیت) **رواه الترمذي** (٧٨٨)] .

**٣٨٠** - وە دوعاکردن بەوەی لێوەی گێردراوەتەوە لە کاتی شوشتنی ئەندامەکانی جەستە .

**٣٨١** - وە پیاو دەست بکات بە شوشتنی ئەندامەکانی، و لەبەر کردنی جلەکانی، خوفەکانی، و پێڵاوەکانی و هەموو جلەکانی : بەلای ڕاست - واتە لەم کارانە لای ڕاست پێش بخات - , وە لە داکەندنیدا بە لای چەپ .

**٣٨٢** - وە بە هەمان شێوە خواردن بە دەستی ڕاست، وە خواردنەوەش بە هەمان شێوە، و وازهێنان لە ئەنجام دانیان بە دەستی چەپ .

**٣٨٣** - وە خۆ پاك كردنەوە بە دەستی چەپ، و وازهێنان لە كردنی بە دەستی ڕاست .

**٣٨٤** - وە دانانی قاچی چەپ لە كاتی چوونە تەوالێت، وە وتنی فەرمایشتەكەی دوای بسم الله كردن كە بریتیە لە : (اللهم اني أعوذ بك من الخبث و الخبائث) .

---

واتە : بەناوی الله، یا الله پەنات پێ دەگرم لە هەموو شەیتانێكی پیسی نێر و مێ . جا ئەمە لە پێش چوونە ناو تەوالێت دەوترێ نەك كە چویتە ناوی ئینجا بیڵێیت .

**٣٨٥** - وە پێش خستنی قاچی ڕاست لە كاتی چوونە دەرەوە؛ وە وتنی : (الحمدلله الذي أذهب عني الأذى و عافاني) .

---

: ئەم زیكرە بە مەوقوفی بۆ **ابو ذر** رضي الله عنه صحيح ە نەك بۆ پێغەمبەر ﷺ، واتاكەشی : سوپاس بۆ ئەو الله یەی كە ئەزیەتی لەسەرم لابرد و پاراستمی . بەڵام ئەوەی كە بە صحیحی لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە ئەوەیە كە فەرموویەتی : (غفرانك) واتە : داوای لێخۆشبوونت لێ دەكەم، ئەمەش دەبێ لە دوای چوونە دەرەوە بیخوێنیت نەك كاتێك كە ویستت بچیتە دەرەوە .

**٣٨٦** - وە بە كارهێنانی ئەو دەیەی كە دەربارەی وتراوە : لە فیترەتن، كە سوننەتی باوكمان ابراهیم ە علیه السلام، پێنج شتن لە سەردا، و پێنجن لە جەستەدا .

ئەوانەی لە سەردان : ئاو لە دەم وەردان، و ئاو لە لوت وەردان، سیواك كردن، و كورتكردنەوەی سمێڵ، وە قژ بكەیتە دوو بەش - لە كاتی داهێنانیدا - .

وە ئەوانەی كە لە جەستەدان : خۆ پاك كردنەوە - تارات گرتن - ، خەتەنە كردن، بەرتاشین، نینۆك كردن، و هەڵكەندنی مووی بن باڵ .

**وە لە سوننەتە :**

**٣٨٧** - كە قاچی ڕاست پێش بخەیت لە كاتی چوونە مزگەوتەوە، و دوای بخەیت لە كاتی دەرچوون لێی .

وە لەكاتی چوونە ناوەوە بڵێیت : اللهم صل على محمد النبي و سلم، و اغفر لي ذنوبي، وافتح لي أبواب رحمتك .

وە لە كاتی چوونە دەرەوە هەمان شت ئەوە نەبێت كە دەڵێیت : وافتح لي أبواب فضلك.

---

: **الترمذي** لە بارەی ئەم زیكرەوە وتویەتی : سەنەدەكەی متصل نییە، بەڵام لە (**صحيح مسلم - ١٥٩٩**) هاتووە كە رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (ئەگەر یەكێكتان چووە مزگەوتەوە با بڵێت : اللهم افتح لي ابواب رحمتك . وە ئەگەر دەرچوو لێی با بڵێت : اللهم اني أسألك من فضلك) .

**وە لە سوننەتە :**

**٣٨٨** - هەبوونی گەورەیی و شكۆ لە مزگەوتدا، وە هێمنی و بێدەنگی لە كاتی ڕۆیشتن لە مزگەوتدا .

**٣٨٩** - وە پیاو پەنجەكانی نەتەقێنێت ئەگەر ویستی نوێژ بكات .

**٣٩٠** - وە لە نوێژدا دەستی نەكات بە ناو یەكدا .

**٣٩١** - وە لە نوێژدا واز بهێنێ لە جموجۆڵ، و ئاوڕدانەوە .

**٣٩٢** - وە وازهێنان لە دەستكاری كردنی ئەنگوستیلە، و ڕیش لە نوێژدا .

**٣٩٣** - وە هەبوونی خشوع و ملكەچیەكی بەردەوام، و سەیركردنی شوێنی سوجدە بردن .

**٣٩٤** - وە دانانی دەستی ڕاست لەسەر چەپ لە خوار ناكەوە، هەروەكو ئەوەی علي بن ابي طالب كردوویەتی رضي الله عنه، و فەرمانی بە كردنیشی كردووە .

---

: ئەمە بە ضعیفی هاتووە كە امام علي فەرمانی پێكردبێ، بەڵام الترمذي لە (**سنن - ٣٢/٢**) كە باسی خیلافی هاوەڵان و تابعین دەكات دەڵێت : هەندێكیان دیوە كە لەسەروو ناوكەوە دەست دادەنێن، وە هەندێكیان دیوە كە لە خوار ناوكەوە دایدەنێن، وە هەموو ئەمانە لای ئەوان فراوانی تێدایە [واتە هەردوو حاڵەتەكە دروستە] .

**٣٩٥** - وە وتنی آمین بە دەنگی بەرز لەو كاتەدا كە ئیمام دەڵێت : ﴿وَلَا الضَّالِّينَ﴾، وە درێژكردنەوەی دەنگ لە كاتی وتنیدا .

**٣٩٦** - وه زۆر یادکردنی الله عز و جل، و باسکردنی علم لەمزگەوتدا، وە وازهێنان لە گاڵتە و گەپ، و فزوڵیەت، و باس و خواسی دونیا تێیدا؛ چونکە مەکروهن .

وە چەند فەرموودەیەکی توند و سەخت بە ڕێگای باش و صحیح، وە پیاوانی متمانە لە بارەیانەوە گێڕاویانەتەوە، لەوانە :

**٣٩٧** - ئەوەی کە عبدالله بن مسعود رضي الله عنه گێڕاویەتیەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی : (لە ئاخر زەماندا کۆمەڵێك دێن لە مزگەوتەکاندا دادەنیشن، ئەوەی لایان گرنگە دونیایە، لەگەڵیان دامەنیشن، چونکە الله هیچ پێویستی پێیان نییە) .

**٣٩٨** - وە لەوانە : ئەوەی کە عبدالله بن عمرو گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی : قیامەت بەرپا نابێت هەتاکو کەسانێك لە مزگەوتەکاندا دانەنیشن کە ئیمانداریان تێدا نییە، باس و خواسیان دەربارەی دونیایە .

**٣٩٩** - وە لەوانە : ئەوەی کە الحسن وتویەتی : سەردەمێك بەسەر خەڵکیدا دێت ئەڵقە ئەڵقە دادەنیشن لە مزگەوتەکاندا، باس و خواسیان دەربارەی دونیایە، لەگەڵیان دامەنیشن؛ چونکە الله عز و جل بە دەستی خۆی وازی لێهێناون .

- لێرەوە قسەی **إِبْنُ بَطَّة** یە : - جا ئەمە هەمووی دەربارەی باسی دونیا و ئەهلەکەیەتی لە مزگەوتەکاندا .

**٤٠٠** - وە کڕین و فرۆشتن بە موجادەلە، و مشتومڕ و ناکۆکی، وە هاوار کردن بۆ ون بوویەك - واتە هاوار بکەی کە شتێکت لێ ون بووە - , وە بڵاوکردنەوەی شیعری غەزەل، وە دەنگ بەرزکردنەوە، و شمشێر هەڵکێشان، وە زۆری ژاوە ژاو، و هاتنە ژوورەوەی منداڵان، و ئافرەتان، و شێتەکان، و لەشگرانەکان، وە سود وەرگرتن لە مزگەوت و بەکارهێنانی بۆ پیشەسازی، و بازرگانی وەکو دوکان : ئەمانە هەموویان مەکروهن، وە ئەنجامدەرەکەیان گوناهبارە لەبەر نەهی کردنی رسول الله ﷺ لەو شتانە، وە توندبوونی لەسەر ئەنجامدەرەکەیان .

---

: فەرموودەیەك نییە بە صحیح هاتبێ دەربارەی دەرکردنی منداڵان و ئافرەتان لە مزگەوتدا، بەڵام **اسحاق بن راهویه** لە (**قیام اللیل - ص ٢٤٣**) وتویەتی : جا ئەگەر منداڵێك بوو نەگەیشتبووە حەوت ساڵ ئەوا ڕێگری لێ دەکرێ لە چونە مزگەوتەوە و ئەمەش هیچ کێشەیەکی تێدا نییە، بەڵام لە ڕیزی یەکەم ڕێگریان لێ دەکرێ [واتە ئەگەر دەریش نەکرێن نابێ بچنە ڕیزی یەکەم], وە دروست نییە منداڵێك دەربکرێ لە مزگەوت کە گەیشتووەتە حەوت ساڵی لە کاتێکدا رسول الله ﷺ فەرمانی بە نوێژ پێ کردووە .

ئەمما دوور خستنەوەی منداڵان لە مزگەوتەکان ئەگەر لە نوێژدا نەبوون، ئەوا سوننەتێکی بەکارهێنراوە ئەگەر گەیشتبوونە حەوت ساڵ یان کەمتر یان زیاتر، هەتاکو ترس هەبێ لە یاری کردن و ژاوە ژاویان، بەڵام ئەگەر هاتن بۆ نوێژ کردن ئەوا ڕێیان لێ ناگیرێ .

وە دەربارەی ئافرەتان لە (**صحیح البخاري - ٥٢٣٨**) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : (ڕێ لە بەندە ئافرەتەکانی الله مەگرن بۆ مزگەوتەکان) .

وە **الترمذي** لە (**سنن - ٤٣٣/٢**) وتویەتی : وە بەشێك لە ئەهلی عیلم بۆ ئەم فەرموودەیە چوونە، و مۆڵەتیان بە ئافرەتان داوە بە چوون بۆ نوێژی دوو جەژنەکە، وە هەندێکیان لایان مەکروه بووە، وە لە عبدالله بن المبارك ـەوە گێڕدراوەتەوە کە وتویەتی : ئەمڕۆ ڕقم لە چوونی ئافرەتانە بۆ دوو جەژنەکە، جا

ئەگەر ئافرەتەکە سوور بوو لەسەر ئەوەی هەر دەبێ بڕوات ئەوا با مێردەکەی ڕێی بدا کە بچێت بە جلێکەوە کە تەسك نەبێ و خۆی جوان نەکات، جا ئەگەر سوور بوو لەسەر ئەوەی بە خۆ جوان کردنەوە بڕوات ئەوا لەسەر مێردەکەیەتی کە ڕێی لێ بگرێ. وە لە عائشة وە رضي الله عنها، فەرمووی: ئەگەر رسول الله ﷺ ببینیایە کە ئافرەتان چیان داهێناوە ئەوا ڕێی لە چوون بۆ مزگەوت لێ دەگرت هەروەك چۆن ئافرەتانی بەنی ئیسرائیل ڕێیان لێ گیرا.

## وە لەو شتانەی کە پێغەمبەر ﷺ نەهی لێکردووە، و توند بووە لەسەر ئەنجامدەرەکەی:

**٤٠١** - ئەوەی کە پیاو لەگەڵ پیاوێکی تردا لە یەك جلدا بن لە نێوانیاندا جگە لەو جلە نەبێت.

**٤٠٢** - وە لەعنەتی لەوانە کردووە کە سەیری ئەو شتانە دەکەن کە لە شەرواڵدایە - والله اعلم، واتە ئەوانەی سەیری عەورەتی یەکتری دەکەن -.

**٤٠٣** - وە نەهی لە مکامعة کردووە؛ کە بریتیە لەوەی: دوو پیاو ڕووت بن لە یەك جلدا - والله اعلم، واتە پێستیان بەر یەکتری بکەوێ، ئەم ئەثەرانە زۆربەی وتویەتی پیاو بەڵام ئافرەتانیش دەگرێتەوە -.

**٤٠٤** - وە نەهی کردووە کە پیاو خۆی ڕووت بکاتەوە لە ماڵێکدا، یان جگە لەو.

**٤٠٥** - یان سەیری عەورەتی غەیری خۆی بکات.

**٤٠٦** - وە ئەوەی کە پیاو باسی ئەو شتانە بکات کە لەگەڵ ژنەکەیدا دەیکات.

**٤٠٧** - وە ئەوەی کە پیاو بە دارلاسیك بەرد بهاوێت، یان قوڕی وشکەوەبوو بهاوێت لە شارەکاندا .

**٤٠٨** - وە پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لە سوێند خواردنی درۆ .

**٤٠٩** - وە ئەوەی کە بەروبووم بفرۆشرێ تاکو پێ دەگات؛ وە پێگەیشتنی بریتیە لە : زەرد هەڵگەڕانی، و سور هەڵگەڕانی - واتە نەهی کردووە لە فرۆشتنی بەروبوومی پێ نەگەیشتوو - .

**٤١٠** - وە لە فرۆشتنی سەگ، و مەیمون، و بەراز .

**٤١١** - وە یاری کردن بە زار و شەترەنج .

---

: بۆ زار فەرمووده هاتووه بەڵام بۆ شەترەنج وتەی هاوەڵان هاتووه کە **ابن عمر** پرسیاری لێکراوە سەبارە بە شەترەنج، فەرموویەتی : لە زار خراپترە . (**تحريم النرد و الشطرنج - ٢٩**)] .

**٤١٢** - وە ئەوەی کە پیاو بە تەنها بێت لەگەڵ ئافرەتێك کە مەحرەمی خۆی نییە.

**٤١٣** - وە ئەوەی کە پیاو بڵێ : ئێمە باشین مادام تۆ هەیت بۆمان .

**٤١٤** - وە ئەوەی تۆ و الله بتانەوێ .

---

: له (**مسند الامام احمد - ٢٥٦١**) هاتووه كه **ابن عباس** وتی : پیاوێك وتی : ئەی پێغەمبەری الله، ئەوەی كه الله و تۆ بتانەوێ .

جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (منت كرده یەكسان بۆ الله، بەڵكو بڵێ ئەوەی الله بیەوێ بە تەنها)] .

**٤١٥** - وە ئەوەی كە پیاو سوێند بە غەیری الله بخوات .

**٤١٦** - وە ئەوەی كە چەقۆكە تیژ بكاتەوە لە كاتێكدا مەڕەكە سەیری دەكا و دەیبینێ .

**٤١٧** - وە ئەوەی كە كرێكار بەكرێ بگرێ تا كرێكەی دەزانرێ - واتە با پێشتر كرێكەی پێ بڵێ چەندە ئینجا بە كرێی بگرێ - .

**٤١٨** - وە لە النجش .

كە بریتیە لەوەی : پیاو نرخی كاڵاكانی زیاد بكات و پێویستیشی بەو زیاد كردنە نەبێ .

---

: النجش واتە فرۆشتنی موزایەدە .

**٤١٩** - وە لە خواردنی گۆشتی ئەو ئاژەڵ و باڵندانەی كە شتی پیس دەخۆن، لەگەڵ شیر و هێلكەشیان؛ لە : حوشتر، و مانگا، و مەڕوماڵات، و مریشك .

**٤٢٠** - وه وتراوه : حوشتر چل ڕۆژ بەند دەكرێ، و مانگا سی ڕۆژ، وه مەڕومالات حەوت ڕۆژ، و مریشك سێ ڕۆژ .

---

: واته بەند دەكرێن بۆ ئەوەی ماعیدەیان لەو خواردنه پیسانەی خواردوویانه پاك ببێتەوه .

**٤٢١** - وه نەهی كردووه له فرۆشتنی الغرر .

**٤٢٢** - وه فرۆشتنی ئەوەی كه هی خۆت نییه، و فرۆشتنی ئەوەی كه له لات نییه، وه لەسەر ئەوەی دوو مەرج دانێن له فرۆشتندا .

---

: **امام احمد** له (**مسائل كوسج** - ١٧٨٣) دەربارەی ئەو دوو مەرجه دەڵێ : بۆ نمونه من بەندەیەكت پێ دەفرۆشم بەو مەرجەی ئەگەر فرۆشتت من شایستەترم پێی، وه دەبێ ساڵێكیش خزمەتم بكا .

**٤٢٣** - وه له لێدانی ڕووخساری ئاژەڵ، و له نیشانەكردنیشی - واته نیشانەكردنی به شتێكی وەكو گوێ بڕینی - .

**٤٢٤** - وه لەوەی كه تف له ڕووخساری مرۆڤ بكەیت .

**٤٢٥** - وه ئەوەی كه ئافرەت سەرجێیی كردن لەگەڵ مێردەكەی ڕابگرێ .

**٤٢٦** - وه ئەوەی کە پیاو شتێك بڵێ کە نەیکا، و بەڵێن بدات و بیشکێنێ، وە باسی نهێنی براکەی بکا .

**٤٢٧** - وە لە ئیسراف و چرووکی .

**٤٢٨** - وە ئەوەی دڵتەنگ بێ بۆ دونیا، و پێی دڵخۆش بێ .

**٤٢٩** - وە ئەوەی کە بەگوێی ژنەکەی بکا لە چوونی ژنەکەی بۆ مارەبڕین، وە بۆ شین و ڕۆڕۆ کردن و لاواندنەوەی مردوو، وە بۆ حەمامە گشتیەکان، وە بە گوێی بکا لە ئارەزووەکانیدا .

**٤٣٠** - فەرمووی ﷺ : (وە هەر کەس بە گوێی ژنەکەی بکات لە هەموو ئەوەی کە دەیەوێت؛ ئەوا بەهۆیەوە بە ڕوودا دەخرێتە ئاگرەوە) .

وە ئەوەی کە بە گوێی بکا لە ئازاردانی باوك و دایکی، و پچڕاندنی سیلەی ڕەحم، وە لە دڵتەنگ کردنی ئەو برایەی کە لە پێناو الله برایەتی .

---

: ئەم فەرموودەیە هەڵبەستراوە بەڵام، **الحسن البصري** دەڵێ : سوێند بە الله ئەمڕۆ هیچ پیاوێك نییە بەگوێی ژنەکەی بکا لە هەموو ئەوەی ژنەکەی دەیەوێ ئیللا الله بە ڕوودا دەیخاتە ئاگرەوە (**الزواجر** ٣٠١/١) .

**٤٣١** - وە فەرمووی ﷺ : (سەرپێچیان بکەن ڕێنمونی دەکرێن، و بەرەکەتتان تێ دەکەوێت) .

---

: واتە سەرپێچی ژنەکانتان، هەر چەندە ئەم فەرموودەیە ضعیف ە لەبەر ئەوەی کە عیسی بن ابراهیم لە سەنەدەکەی هەیە کە ضعیف ە، بەڵام لە (**الجعدیات** - ٣٠٨١) **امام عمر** دەفەرمووێ : پێچەوانەی ئافرەتان بکەن چونکە لە پێچەوانەی ئەواندا بەرەکەت هەیە .

**٤٣٢** - وە نەهی کردووە لە زیان پێگەیاندنیان، و هێرش کردنە سەریان و لێدانیان .

**٤٣٣** - وە فەرمانی کردووە بە دادپەروەری، و یەکسانی لە دابەش کردن بەسەریاندا .

**٤٣٤** - وە نەهی کردووە لە ئازاردانی دراوسێ .

**٤٣٥** - وە لە کیبر وخۆ بە گەورەزانین، و توانج دان لە نەسەب، و غەیبەت، وە چاو داگرتن و ئاماژە کردن بە چاو بۆ ئەوەی تانە لە کەسێك بدرێ .

**٤٣٦** - وە جنێو دان بە کۆیلە و ژێردەستەکان، و لێدانیان .

**٤٣٧** - وە فەرمانی کردووە کە خواردنیان پێ بدرێ لەو خواردنەی کە خۆیان دەیخۆن - واتە خاوەنەکەی چی دەخوات دەبێ ئەوەش بە کۆیلەکەی بدات - , وە پۆشتەیان بکات لەوەی کە خۆی پێ پۆشتە کردووە، وە داوای کردنی کارێکیان لێ نەکرێ کە لە توانایاندا نەبێت، وە لێیان ببوردرێت، تەنانەت ئەگەر لە ڕۆژێکدا حەفتا هەڵە و تاوان بکەن .

**٤٣٨** - وه نه‌هی كردووه له‌وه‌ی پیاو ده‌نوك بدات له نوێژه‌كه‌یدا وه‌كو ده‌نووكی كه‌ڵه‌شێر - واته نه‌هی كردووه له نوێژ كردن به خێرایی كه ڕكوع و سجودی ته‌واو نه‌بێ - .

**٤٣٩** - وه له‌وه‌ی كه سوجده ببات پێش ئه‌وه‌ی كه سه‌ری به‌رز بكاته‌وه له ڕكوع .

---

: واته كاتێك ده‌چێته سمع الله لمن حمد، ئه‌وا ده‌بێ پشتی به ته‌واوی ڕێك ببێته‌وه و ئینجا بچێته سوجده .

**٤٤٠** - وه ئه‌وه‌ی كه قۆڵه‌كانی ڕابخات - واته له سوجده‌دا - وه‌كو چۆن سه‌گ قۆڵه‌كانی ڕاده‌خات .

**٤٤١** - وه له‌وه‌ی كه دابنیشێت وه‌ك دانشیتنی مه‌یمون .

---

: واته كاتێ ده‌چێته ته‌حیات یان نێوان سوجده‌كان، به شێوه‌ی مه‌یمون دانه‌نیشێ كه دانیشتنێكه له نێوان قاچه‌كانی دانیشتوه .

**٤٤٢** - وه له‌وه‌ی كه سه‌ری به‌رز بكاته‌وه و دای بنه‌وێنێ پێش ئیمام یان له‌گه‌ڵ ئه‌ودا بیكا .

---

: واته نابێ پێشی ئیمام بکەوی لە نوێژدا و نابێ لەگەڵ ئەو بیکەی بەڵکو لە دوای ئەو بیکە، واتە بۆ نمونە امام دەبێ بڵێ الله اکبر وە بچێتە جوڵەی دواتر ئینجا تۆ بڵێی الله اکبر و بچیتە جوڵەی داهاتوو .

**٤٤٣** - وە فەرمووی ﷺ : (ئایا ئەوەی کە پێش ئیمام سەری بەرز دەکاتەوە؛ ناترسێ الله سەری بگۆڕێ بە سەری گوێدرێژ) .

**٤٤٤** - وە فەرمووی ﷺ : (هەر کەس سەری بەرز بکاتەوە یان دای نەوێنێ لە پێش ئیمامەوە؛ ئەوا نوێژی بۆ نییە) .

**٤٤٥** - وە نەهی کردووە لە دەست دانان لەسەر ناوك لە نوێژدا .

**٤٤٦** - وە نەهی کردووە لەوەی کە بنی پێی بشوات بە لەپی دەستی جار لە دوای جار .

**٤٤٧** - وە نەهی کردووە لە باوێشك دان، و فووکردن .

**٤٤٨** - وە پاك کردنەوەی شوێنی سوجدە لە وردە بەرد و خۆڵ لە نوێژدا - ئەنجامدانی ئەمە یەك جار ڕێگە پێدراوە - .

**٤٤٩** - وە لەوەی کە ناوچەوانی لە خۆڵ بسڕێ پێش ئەوەی سەلام بداتەوە .

**٤٥٠** - وە لەوەی کە سەری بەرز بکاتەوە بۆ ئاسمان لە نوێژەکەیدا .

**٤٥١** - وە لەوەی کە چاوەکانی لە سوجدەدا بنوقێنێ .

**٤٥٢** - وه قورئان بخوێنێ له ڕكوع و سوجدهدا - واته نابێ بیخوێنێ تێیاندا - .

**٤٥٣** - یان گرتنی قژ، یان جل - والله اعلم، واته له كاتی سوجدهدا نابێ دهستیان پێوه بگرین، بهڵكو وهكو خۆ به كهم زانینێك دهبێ جلهكان و قژیشمان سوجده ببهن و ڕێیان لێ نهگرین - .

**٤٥٤** - وه له بهردانهوهی ههردوو دهست - واته نههی كردووه لهوهی كه دهست نهگریت له نوێژدا، كه له ئێستادا شیعهكان دهیكهن - .

**٤٥٥** - وه له پێچانهوهی جهسته - واته جلێك له بهربكات كه نهتوانێت دهستی لێوه دهربهێنێ، والله اعلم - .

**٤٥٦** - وه لهوهی كه پیاو نوێژ بكات به جلێكی كراوهوه ئهگهر لهسهر كراسهكهی عهبایهك نهبوو، یان له ژێرهوه هیچی لهبهر نهبوو .

**٤٥٧** - وه لهوهی كه نوێژ بكا به كراسێكی تهنكهوه كه جگه لهوه هیچی له ژێرهوه له بهردا نهبێ .

**٤٥٨** - وه لهوهی كه بهسهر خهڵكیدا بڕوا له نوێژدا .

---

: دیاره مهبهستی فهرموودهكهی ***عبدالله بن بسره*** رضي الله عنه كه وتی : پیاوێك هات بهسهر خهڵكیدا دهڕۆیشت له ڕۆژی جومعهدا [واته پیاوهكه دواكهوتبوو له خوطبه], جا پێغهمبهر ﷺ پێی فهرموو : (دانیشه چونكه ئازاری خهڵكیت دا و ...) **(رواه ابو داود : ١١١٨)**] .

**٤٥٩** - وە لەوەی کە پیاو لە ڕیزی دووەم نوێژ بکات لە کاتێکدا لە ڕیزی یەکەم بۆشاییەکی بۆ هەیە .

**٤٦٠** - وە لەوەی کە پیاو پشت بدا بە دیوارەوە لە کاتی نوێژدا - واتە نابێ پاڵ بدات بە هیچ شتێکەوە بەڵکو دەبێ ڕێك بوەستێ لە نوێژەکەیدا - .

**٤٦١** - وە لەوەی کە پیاو لەسەر دیوار نوێژ بکات .

**٤٦٢** - وە لەوەی کە پیاو نوێژ بکا لە تەوالێت و حەمام، و گەوڕی حوشتر، و سەر ڕێگا - وەکو جادە و بازاڕ - ، وە گۆڕستان، و کوشتارگەی ئاژەڵ، و زبڵدان، و سەربانی کەعبە - چونکە لە سەربانی کەعبە ناتوانێ ڕوو بکاتە قیبلە - .

**٤٦٣** - وە لەوەی کە پیاو لە نوێژەکەی تەواو بێ و لە کاتێکدا گومانی لێی هەیە.

---

: واتە گومانی هەبێ لەوەی کە هەموو ڕوکن و واجبێکی لە نوێژەکەی تەواو کردبێ کەچی سەلامیش بداتەوە .

**٤٦٤** - وە پێغەمبەر ﷺ لەعنەتی کردووە لە الواشمة و المستوشمة؛ کە ئەوانەن خاڵ دەکوتن و خاڵیان بۆ دەکوترێ - والله اعلم، تاتۆش هەمان شتە - .

وە لە الواصلة و المستوصلة؛ کە ئەوانەن قژ گرێ دەدەن بە قژەوە، و ئەوانەش کە بۆیان دەکرێ - واتە بۆ ئەوەی قژیان درێژ دەربکەوێ - .

وە لە النامصة و المتنمصة؛ کە ئەوانەن موو هەڵدەکەنن، و بۆیان هەڵ دەکەندرێ - والله اعلم، مەبەستی مووی ڕووخسارە - .

وە لە الواشرة و المستوشرة؛ کە ئەوانەن ددان شاش دەکەن، و ئەوانەش کە بۆیان دەکرێ .

**٤٦٥** - وە فەرمووی ﷺ : (هەر کات ئافرەتێك جلەکانی داکەند لە غەیری ماڵی مێردەکەی؛ ئەوا هەتکی ئەو سیتر و داپۆشینەی کردووە کە لە نێوان خۆی و الله دا هەبووە) .

## وە لەو شتانەی کە پێغەمبەر ﷺ ئوممەتەکەی پێ پەروەردە کردووە، وە بانگی کردوون بۆ بەرزترینی ڕەوشتەکان، و بەڕێزترین کردەوەکان :

**٤٦٦** - نەهی کردنیەتی ﷺ لەوەی کە پیاو خواردنی بەردەم براکەی بخوات - واتە ئەوەی لێت نزیکە ئەوە بخۆ - .

**٤٦٧** - وە لەوەی کە خواردن بخورێت لە بەرزترین شوێنی قاپەکە، وە فەرموویەتی : (بەرەکەت دادەبەزێتە سەر ناوەڕاستەکەی) .

---

: واتە نەهی لەوە کردووە کە لە ناوەڕاستی قاپەکە دەست بە خواردن بکرێ بۆ ئەوەی بەرەکەتەکەی نەڕوات .

**٤٦٨** - وە فەرمانی کردووە بە دەست شوشتن لە پێش و پاشی نان خواردن .

وە فەرموویەتی : (ئەمە فەقیری دوور دەخاتەوە) .

**٤٦٩** - وە هەروەها فەرمووی ﷺ : (هەر کات قەومێك بەردەوام بوون لەسەر دەستنوێژ گرتن لە پێش نان خواردن و لە پاشی؛ ئیللا الله بەوە فەقیریان لەسەر لا دەبات) .

---

: سەنەدی ئەم فەرموودەیە نازانم چۆنە، بەڵام فەرموودەیەك هەیە کە لەمەوە نزیکە کە **ابو** *زرعة* دەربارەی وتویەتی : فەرموودەیەکی منکر ە (**علل الحديث لابن ابي حاتم - ١٥٠٥**)] .

**٤٧٠** - وە فەرمانی کردووە بەوەی کە پیاو ئەو خواردنە بخوات کە لە قاپەکەی دەکەوێتە خوارەوە، وە فەرموویەتی : (هەر کەس ئەوە بخوات : هەژاری لێ دوور دەخرێتەوە، وە گێلی لە منداڵەکانی دوور دەخرێتەوە) .

**٤٧١** - وە نەهی کردووە لەوەی پیاو بخەوێ لە کاتێکدا دەستەکانی پاشماوەی گۆشتی پێوە ماوە - واتە چەوری پێوەیە - .

**٤٧٢** - وە لەوەی نان بخوات و بخەوێت لە کاتێکدا لەشگرانە .

**٤٧٣** - وە پێی خۆش بوو بۆ هەر کەس بیەوێت کە بخەوێت، یان بخوات لە کاتێکدا لەشگرانە ئەوا - لە پێشدا - دەستنوێژ بگرێ بەو شێوەیەی کە دەستنوێژ بۆ نوێژ دەگرێ .

**٤٧٤** - وە نەهی کردووە لە خواردنی دوو خورما بە یەکەوە؛ وە ئەمە کاتێك دێتە سەر بکەری ئەم کارە کە لەبەر خراپی خواردنەکەی بێ .

**٤٧٥** - وە لەوەی کە پیاو سەیری پارووی براکەی بکا کاتێك نان دەخوات .

---

: ئەو فەرموودانەی کە دەربارەی ئەو بابەتانە هاتوون کە لە ئەثەری **٤٧٤** و **٤٧٥** هەن، صحیح نین.

**٤٧٦** - وە پێی خۆش بوو کە الثرید دابپۆشرێ، و فەرمووی : (بەرەکەت بەسەریدا دادەبەزێ) .

---

: الثرید خواردنێکی عەرەبیە لە گۆشت و نان پێکدێ، بە کوردی پێی دەوترێت تریت .

**٤٧٧** - وە نەهی کردووە لە خواردنی بە گەرمی .

**٤٧٨** - وە نەهی کردووە لە خواردنەوە لە دەمی کوندەوە، لەبەر ئەوەی ئەو کەسەی کە لە دەمەکەیەوە دەیخواتەوە نازانێت لە ناوەوە چی تێدایە .

وە وتراوە : کە پیاوێك لە کوندەیەکی چەرم ئاوی خواردبوەوە، وە مارێکی تێدابووبوو، جا پێی نەزانی هەتا مارەکە چووە قورگی .

وە هەروەها وتراوە : کە خواردنەوە لە دەمی کوندەوە بۆنی دەگۆڕێت .

**٤٧٩** - وه له نههیهكانی ئهو ﷺ ئهوهیه كه پیاو له سهفهر لابدات و لهسهر ڕێگاوبانهكان بمێنێتهوه بۆ حهسانهوه؛ چونكه ڕێگاوبان ڕێگهی خهڵكی، و مێرووهكان، و جنهكانه؛ ههروهها ئهو كاره دهبێته بارگرانی بۆ ئهوانهی كه پێیدا دهڕۆن، پاشان نوستوو نازانێت كه چی بهردهكهوێ لهوێدا .

**٤٨٠** - وه نههی كردووه له پیسایی كردن لهسهر ڕێگاوبان؛ و فهرموویهتی : (بترسن لهوانهی توشی لهعنهتتان دهكهن) .

وتیان : جا ئهوانه چین؟، فهرمووی : (پیسایی كردن لهسهر ڕێگاكان) .

وه دهوترێ : كه پیسایی زیاد بوو لهسهر ڕێگاكان؛ ئهوا باران بارین دهگیرێتهوه .

**٤٨١** - وه نههی كردووه لهوهی كه پیاو له ژێر دارێكدا پیسایی بكات كه بهروبومی پێوهیه؛ چونكه لهوانهیه بهروبومهكه بكهوێته خوارهوه بۆ ناو پیساییهكه، یان بۆ نزیكی؛ جا بهمه واز له بهروبومهكه دههێنرێ و خهسار دهبێ .

**٤٨٢** - وه نههی كردووه كه پیاو سهرجێیی بكا له ژێر دارێكی بهروبومدا .

**٤٨٣** - وه لهوهی كه دوو كهس پیسایی بكهن و بهیهكهوه قسه بكهن، یان پیاو قسه بكات له كاتێكدا له تهوالێته .

**٤٨٤** - یان قسه بكا له كاتی سهرجێییدا، یان سهیری دامێنی ژنهكهی بكا له كاتی سهرجێیی، یان ژنهكهی سهیری ههمان شتی ئهو بكاتهوه.

---

: ئەو فەرموودانەی دەربارەی ئەمە هاتوون هیچیان جێگیر نین و هەموویان هەڵبەستراون .

**٤٨٥** - یان هەردووکیان بە یەك پارچە پەڕۆ دامێنیان بسڕن .

---

: ئەمە پێچەوانەی ئەوەیە کە لە **عائشة** گێڕدراوەتەوە هەروەکو البیهقي لە (الکبری - ٤١١/١) هێناویەتی .

**٤٨٦** - وە لە نەهیەکانی ئەو ﷺ ئەوەیە کە پیاو هەڵسێ لەبەر پیاو؛ مەگەر بۆ باوکی، یان پیاوێکی زانا، یاخود پێشەوایەکی دادپەروەر .

---

: **انس بن مالك** رضي الله عنه فەرمووی : هیچ کەس نەبوو خۆشەویستتر بێ لایان وەك لە رسول الله ﷺ، فەرمووی : جا ئەگەر بیان دیتایە هەڵنەدەستان لەبەری چونکە دەیانزانی ئەوەی پێ ناخۆشە (**رواه الترمذي** [**٢٩٧٨**] و قال : حسن صحيح غريب].

**٤٨٧** - وە نەهی کردووە لەوەی پیاو پێی خۆش بێت لەبەری هەستن؛ وە فەرموویەتی : (هەر کەس پێی خۆش بوو پیاوان ڕێزی بۆ بنوێنن بە هەستان لەبەری؛ ئەوا با جێگەکەی لە ئاگردا مسۆگەر بکات) .

**٤٨٨** - وە فەرمووی ﷺ : (هەر کەس هەستا بۆ ئەوەی خەڵکیش لەبەری هەستێ؛ ئەوا الله سەیری ناکات) .

**٤٨٩** - وە فەرمووی ﷺ : (هەر کەس هاوەڵەکەی لە دونیا بە گەورە زانی؛ وەکو ئەوە وایە کە بتەکان بە گەورە بزانێ) .

**٤٩٠** - وە فەرمووی ﷺ : (هەر کەس هاوەڵی دونیای بە گەورە ڕاگرت؛ ئەوا داهێنانێکی کردووە) .

**٤٩١** - وە فەرمووی ﷺ : (هەر کەس چووە ژوورەوە بۆ لای هاوەڵی دونیا و ملکەچی و زەلیلی نواند؛ ئەوا یەك لەسەر سێی دینەکەی نامێنێ) .

## وە لە ئادابەکانی ئەو ﷺ :

**٤٩٢** - نەهی کردنیەتی لەوەی کە پیاو فوو بکا لە خواردن، و خواردنەوەکەی .

**٤٩٣** - وە فەرمووی ﷺ : (هەر کەس پارووپەکی لە دەست کەوت ئەوا با هەڵی گرێتەوە، و بیخوا، و یان بیداتە کەسێکی تر، وە لێی نەگەڕێت بۆ شەیتان)

: واتە پیسیەکەی لا ببات و بیخوات .

**٤٩٤** - وە ئەو ﷺ خورمای دەخوارد و دەری دەکردەوە .

که واتاکەی ئەوەیە : بە ڕووی دەستی خورماکەی بخوات، وە ناوکەکەی بخاتە سەر پشتی پەنجەکانی .

جا ئەم ئادابانە و هاوشێوەکانیان کە بە باسکردنیان کتێبەکە درێژ دەبێتەوە لە ئاداب و فەرمان و نەهیەکانی؛ واجبە لەسەر ئەو کەسەی ڕەوشتی دەوێت بەکاریان بێنێ، و بۆیان بگەڕێ، و شوێنی بکەوێ لەوەدا، وە سەرەنجامەکەی بۆ بە گوێ کردنی بێ، و سونەتەکەی وەربگرێ؛چونکە عەقڵەکان دەلالەتی لێ دەکەن، و نەفسی عاقڵیش پێشبڕکێی بۆ دەکات .

وە لە هەموو ئەمانەدا ئەدەب، و پاك و خاوێنی، و خۆپارێزی هەیە لە مەکروهەکان .

وە ئەوەمان باس کرد کە لەبەردەستمانە، و ئەوەش کە نزیکە باسکردنیان بۆ خەڵکی هیچ زانیاریەکیان پێی نەبێ، وە هەر دەبێ بەکاریشی بێنن، و لەوانەی کە پێویستی زۆریان پێیەتی، و عوزر نیە بۆ هەر کەس کە نەیان زانێ، و کەم و کورتی هەبێ لە بە دوا گەڕانیان .

# بەشی چوارەم

## ئاگاداری دان لە بیدعە



وە ئێمە ئێستا لە دوای ئەوە - واتە دوای پەرستشەکان و ئادابەکان - بیرخەرەوەی ئەو بیدعە و داهێنراوانەین کە خەڵکی دایان هێناون لە کاتێکدا هیچ بنچینەیەکی نییە لە کتێبی اللە، وە نەشهاتوە لە هیچ ئەثەرێکدا، وە ئەگەر چی بکەری ئەم کارانە جیا نەبووبێتەوە لە دین، و دەرنەچوبێ لە میللەت، ئەوا بە ڕاستی گوناهێکی مەزنی ئەنجامداوە بەو داهێنانەی کە وا اللە ئیزنی پێ نەداوە - واتە ئەگەر پێشی کافر نەبووبێ هەر گوناهەکەی گەورەیە - .

## لەوانەی : کە رسول الله ﷺ بە حەڕامی داناوە و توند بووە تێیدا، بریتیە لە :

**٤٩٥** - شین و ڕۆڕۆ کردن و لاواندنەوەی مردوو، وە گوێگرتن بۆی، وە فەرموویەتی : (ئەوە لە کردەوەی جاهیلیەتە) .

**٤٩٦** - وە فەرمووی ﷺ : (پارە پەیداکردنی ئەو کەسەی کە شین و ڕۆڕۆ دەکات لە بەرتیلە) .

---

: واتە وەکو بەرتیل هەژمار دەکرێ، والله اعلم .

**٤٩٧** - وە لەعنەتی لە کەسی شین و ڕۆڕۆکەر کردووە لە شوێنێکی تردا .

**٤٩٨** - وە ابن عمر رضي الله عنهما فەرمووی : شین و ڕۆڕۆ کردن حەڕامە، و گوێ لێ گرتنی بیدعەیە .

**٤٩٩** - وە ابراهیم وتی : پارە پەیداکردن بە گۆرانی و شین و ڕۆڕۆ لە بەرتیلە .

**٥٠٠** - وە عمر بن الخطاب رضي الله عنه ئافرەتێکی شین و ڕۆڕۆکەری بۆ هێنرا، جا لێی دا، تاکو قژی دەرکەوت، بۆیە پێی وترا : ئەی پێشەوای بڕواداران، ئەوە قژی دەرکەوت !

فەرمووی : الله دووری بخاتەوە، هیچ ڕێزێکی نیە .

وترا : جا بۆچی؟

فەرمووی : چونکە ئەو فەرمان دەکات بە ئارامی نەگرتن، لە کاتێکدا الله عز و جل نەهی لێ کردووە، وە ئەو نەهی لە ئارام گرتن دەکا، لە کاتێکدا الله عز و جل فەرمانی پێکردووە، وە درهەم وەردەگرێ لەبەرامبەر

فرمێسکەکانی، وە لەبەر موصیبەتی غەیری خۆی دەگری، وە زیندوو دڵتەنگ دەکا، و ئازاری مردوو دەدات .

**٥٠١** - وە ابن عون وتی : چووم بۆ کوفە، بینیم پیاوانێك شیوەن دەکەن لەسەر ڕێگاکە، جا پرسیارم سەبارەت بەوە کرد؟! وترا : بۆ الحسین رضي الله عنه شیوەن دەکەن .

بۆیە چووم بۆ لای ابراهیم و ئەوەم پێ ڕاگەیاند، وتی : خەڵکی کوفە بەردەوام خەریکی دامێنانی بیدعەن لە هەموو ساڵێکدا هەتاکو وای لێدێ حەق لایان دەبێت بە بیدعە .

## وە لە بیدعەکان :

**٥٠٢** - گوێگرتن لە ئافرەتانی گۆرانیبێژ، وە گوێگرتن لە گۆرانی .

**٥٠٣** - وە ابن مسعود رضي الله عنه فەرمووی : گۆرانی دووڕوویی لە دڵدا دەڕوێنێ هەروەکو چۆن ئاو سەوزە دەڕوێنێ .

## وە لە بیدعەکان :

**٥٠٤** - ئەستێرەناسی، و سەیر کردنیان، و پشت بەستن پێیان - مەبەستی ئەوەیە کە گوایە داهاتووی پێ دیاری دەکەن، کە لە ئێستادا پێی دەوترێ بورجەکان - .

بەڵکو ئەوە لقێکی شیرکە، و بانگەشە کردنە بۆ عیلمی غەیب .

وە هەموو ئەمانە نەهی لێکراوە، وەکو : ئەستێرەناسی، وە العیافة، و فاڵ گرتنەوە، و الزجر، و التطیر .

---

: الزجر و العیافة : واتە مژدەدان و بە شوم دانان بە دەنگ و ناوی باڵندەکان، و بەو ڕێیەش کە بۆی دەڕۆن، بۆ نمونە لای خۆمان ئەگەر بایەقوشیان ببینیایە دەیان وت کەسێك دەمرێ .

وە التطیر : واتە بە شوم دانانی شتێکی بەرجەستە یان بیتسراو . واللە اعلم .

**٥٠٥** - وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (هەر کەس چووە لای کاهینێك، یان فاڵچییەك و بە ڕاستی دانا؛ ئەوا کافر بووە بەوەی اللە دایبەزاندووەتە سەر دڵی محمد ﷺ) .

**٥٠٦** - وە فەرمووی ﷺ : (هەر کەس لقێك لە ئەستێرە ناسی بگرێتە بەر، ئەوا لقێکی لە شیرك گرتوەتە بەر، وە هەر کەس زیاتر بگرێتە بەر ئەوا بۆی زیاتر دەبێ - واتە شیرکەکەی بۆ زیاتر دەبێ - ) .

**٥٠٧** - وە علي بن ابي طالب رضي اللە عنە فەرمووی : ئاگادارتان دەکەمەوە لە زانستی ئەستێرەناسی، مەگەر ئەوە نەبێ کە بەکاردێ بۆ ڕێ نیشاندان لە تاریکییەکانی

وشكانی و دەریادا؛ چونکە ئەستێرەناس وەکو جادووگەر وایە، وە جادووگەر کاهینە، وە کاهین کافرە، و کافریش لە ئاگردایە .

## وە لە بیدعەکان :

**٥٠٨** - ئەوەیە کە پیاو سەر و ڕیشی ڕەنگ بکات بە ڕەش .

**٥٠٩** - یان لە پانایی ڕیشی بگرێ و کورتی بکاتەوە .

---

: کورتکردنەوەی بەشی درێژیەکەی هەندێك لە زانایان ڕێگەیان پێداوە وەك **امام مالك** لە (**الموطأ - باب التقصير**)، وە **امام الشافعي** لە (**الأم - ما يفعل المرء بعد الصفا و المروة**)، وە **امام احمد** یش بە هەمان شێوە هەروەکو الخلال لە (**الترجل - ١١٤**) هێناویەتی، کە تێیدا :

پرسیارم لە احمد کرد ئایا لە پانایيەکەی کورت دەکاتەوە؟ وتی : ئەوەندەی لێ دەگرێ کە لە مشتێك دەردەچێ - واتە بە مشتێك ڕیشی دەگرێ و چەندی لێ زیاد بوو دەتوانێ کورتی بکاتەوە - .

وتم : ئەی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ چی کە دەفەرموێ : (سمێڵ کورت بکەنەوە، و ڕیش بهێڵنەوە).

وتی : لە درێژیەکەی دەگرێ، لەگەڵ ژێر قوڕگی .

**٥١٠** - یان سمێڵی درێژ بکاتەوە .

**٥١١** - وە وتراوە : یەکەم کەس کە ڕەنگی کردووە بە ڕەش فیرعەون بووە .

**٥١٢** - وە وتراوە : ئەوە ڕەنگ کردنی ئەهلی ئاگرە .

**٥١٣** - وە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە هێشتنەوەی ڕیش، و کورت کردنەوەی سمێڵ کردووە .

**وە لە بیدعەکان :**

**٥١٤** - ئەوەیە کە پیاو بۆنی خۆی بە زەعفەران خۆش بکات، یان خەنە بدات لە دەستی .

**وە لە بیدعەکان :**

**٥١٥** - ئەوەیە پیاو شەڕواڵەکەی بکەوێتە خوار قولە پێیەوە .

**٥١٦** - وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (الله سەیری کەسێك ناکات کە شەڕواڵەکەی خستوەتە خوار قولە پێکانیەوە لەبەر لە خۆبایی بوون) .

**وە لە بیدعەکان :**

**٥١٧** - سەیرکردنی کتێبی ڕوقیەکانە - مەبەستی ڕوقیە بیدعی و شیرکیەکانە - ، وە کار کردن پێیان، و بانگەشە کردن بۆ وتەکانی جن، و بەکارهێنانان، وە کوشتنی هەندێکیان.

**وە لە بیدعەکان :**

**٥١٨** - هەڵواسینی چاوەزار و نوشتە بە بێ ئەوەی پێویستی بێ، یان بۆ نەخۆشیەك لە خاوەنەکەیدا .

---

: سەلەف خیلافیان لەم بابەتەدا هەبووە، بەشێکیان مۆڵەتیان داوە بە هەڵواسینی نوشتە ئەگەر بێت و لە قورئانەوە وەرگیرابێ، وە هەڵواسینی نوشتە شەرعیەکان، بەو مەرجەی کە هەڵواسینەکەی دوای ڕوودانی موصیبەتەکە بێت نەك لە پێشدا هەڵی بواسێت بە مەبەستی ئەوەی چاو و نەخۆشی لێ دوور بخاتەوە، بەڵام هەندێك لە هاوەڵانی وەکو ابن مسعود زۆر ڕقیان لەم کارە بووە .

## وە لە بیدعەکان :

**٥١٩** - ئەوەیە کە ئافرەتان شوێنی جەنازە بکەون .

**٥٢٠** - وە تێیدا لە ڕوومەتەکان بدرێ، وە ئەوەی پیاوان بە پێی پەتی بڕۆن و نەعلەکانیان بە دەستیانەوە بێت .

## وە لە بیدعەکان :

**٥٢١** - قیژە کردن، و لە ڕوومەت دان، و دڕاندنی جل و بەرگ لە کاتی بیستنی زیکر و قورئان؛ چونکە ئەوە لەو شتانەیە کە خەڵکی دایان هێناوە و بیدعەیان کردووە .

**٥٢٢** - وە انس بن مالك رضي الله عنه فەرمووی : رسول الله ﷺ ئامۆژگاری کردین بە ئامۆژگاری کردنێك کە دڵەکان لێی دەترسا و دەمات لەرزین، وە چاوەکان فرمێسکی دەڕشت، بۆیە کەسێك قیژەیەکی کرد لە لایەکی مزگەوتەکەوە .

جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (ئەوە کێیە دینەکەمان لێ چەواشە دەکات؟! ئەگەر ڕاستگۆ بووبێت ئەوا خۆی بە ناوبانگ کرد، وە ئەگەر درۆزن بووبێت ئەوا الله بە هیلاکی بەرێت) .

: ابن عدي (**الكامل - ٣٤٦/٥**) ڕیوایەتی كردوە و هەڵبەستراوە .

**٥٢٣** - الفضيل بن عياض وتی : موسى بن عمران عليه السلام ئامۆژگاری قەومەكەی كرد؛ جا پیاوێك جلەكەی بەری دڕاند؛ بۆیە الله تبارك و تعالى وەحی بۆ موسى عليه السلام نارد، پێی بڵی : ئەگەر ڕاستگۆیە با لەبەر من دڵی شەق بكات .

**٥٢٤** - وە ابن المبارك وتی : ئەوانەی كە دەبووریێنەوە لە كاتی گوێگرتن لە زیكر دایان دەنیشێنین لەسەر دیواری بەرز، بەسەریاندا قورئان دەخوێنینەوە، چاوەڕێ دەكەین بزانین لە هۆش خۆیان دەچن .

**٥٢٥** - وە بەشێك لە خەڵكی : دونیانەویستی نیشان دەدەن، چوونە گوێیان لە سروود گرتووە وە كۆبوونەوەیان لەسەر ئەوە لایان بووە بە سوننەت؛ بۆ ئەوەی خۆشییەك بۆ نەفس و بیستنیان بەسەر بەرن، وە دڵەكانیان پێی ئاسوودە بكەن، وە تێیاندایە كە سەما دەكات، و چەقەنە بە دەستی لێدەدات، و جلەكانی دەدڕێنێ، وە لە وتەكانیاندا دەڵێن : (الله عز و جل فەرمووی)، (وە الحوراء وتویەتی), (وە الولي وتويەتی).

شتێك - دەڵێن - كە الله نەیفەرمووە، و لە ئەثەر، و سوننەتیش نەهاتووە، وە الحوراء، و الولي نەیانوتوە؛ وە ئەمە بیدعەیە و درۆیە و بوهتانە .

**٥٢٦** - وە کۆمەڵێکی تر : زوهد و خواپەرستی دەردەخەن، وە کەسابەت، و بژێوی حەرام دەکەن، وە زۆرلێکردنیان لا دروستە لە سواڵ کردن و ئیلحاح کردندا، وە بانگەشەی جۆش و خرۆش و خۆشەویستی دەکەن بە پەك خستنی ترس و ئومێد .

وە ئەمانە هەموویان بیدعەن، وە ئەوەی بانگەشەی ئەمانە دەکا : بێزراوە لای ئەهلی عیلم و مەعریفەت؛ چونکە الله عز و جل ڕێی بە کەسابەت، و پیشەسازی، و بازرگانی داوە، لەسەر بنچینەی قورئان و سوننەت هەتاکو بەرپا بوونی قیامەت، وە سواڵ کردن و ئیلحاح کردنی حەڕام کردووە ئەگەر پێویستی پێیان نەبێ .

---

: کۆمەڵێك لە صۆفیەکان دەڵێن یا الله ناتپەرستین لەبەر ترسان لە ئاگرەکەت، وە یان لەبەر ویستنی بەهەشتەکەت، بەڵکو وەکو ڕێزێك بۆ ڕووی تۆ و خۆشەویستیت دەتپەرستین . جا ئەمە گومڕاییە و پێچەوانەی قورئان و سوننەتە، بەڵکو لای ئەهلی سوننە الله هەم لەبەر خۆشویستنی و هەم لەبەر ترسان لێی و هەمیش لەبەر ئومێد هەبوون پێی دەپەرسترێ، چونکە الله سەبارەت بە پێغەمبەر زەکەریا و هاوسەرەکەی دەفەرموێ : ﴿إِنَّهُمْ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلْخَيْرَٰتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا وَكَانُواْ لَنَا خَٰشِعِينَ﴾ [الأنبياء : ٩٠] .

واتە : ئەوان پێشبڕکێیان لە چاکەدا دەکرد و بە ترس و ئومێدەوە لێمان دەپاڕانەوە و بۆشمان ملکەچ بوون .

**٥٢٧** - وە زانایان کۆدەنگیان هەیە و جیاوازیان لە نێواندا نییە : کە الله عز و جل فەرزی کردووە لەسەر دروستکراوەکانی : ترس، و ئومێد، وە بانگی بەندەکانی کردووە ئومێدیان هەبێ پێی و ترسیان لێی هەبێ .

وه لەو بیدعه داهێنراوانەی کە هیچ ئەصلێکی نیە لە قورئان، و لە سوننەت، و چوێنراون بە کردەوەی جاهیلی، بریتین لە :

**٥٢٨** - کۆبوونەوەیان و یەك گرتنیان لە نێوان خۆیان لەسەر پشتگیری، و یەکتر سەرخستن .

ئەمە بیدعەیەکی بێزراوە، و لە جاهیلیەتدا دەیان کرد؛ جا الله عز و جل بە ئیسلام لای برد، وە نەهی لێکرد لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ .

---

: واتە بچیت بەڵێن و پەیمانێك دابهێنیت کە لە قورئان و سوننەت بوونی نەبووبێ، جا هەر کەس لەسەر ئەوە لەگەڵت کۆك بوو و بەڵێنی پێتدا پشتی بگری، و هەر کەس نەیکرد دژی بوەستی .

**٥٢٩** - وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (هیچ هاوپەیمانیەك و کۆمەڵ کۆمەڵێنێك نییە لە ئیسلامدا، وە هەر پەیمانێك لە جاهیلیەتدا درابێ ئەوا ئیسلام هیچی لێ زیاد ناکات جگە لە تەئکید لێ کردنەوە) .

---

: لە ڕیوایەتێکی تر دەفەرموێ : (ئیسلام توند و تۆڵتری دەکا)، واتە هەر بڕیار و پەیمانێك کە شیاو بووبێ بۆ نمونە حلف الفضول کە لە جاهیلیەتدا پەیمانێك بوو بەسترا بۆ سەندنەوەی مافی ستەم لێکراوان و سەرخستنیان جا رسول الله ﷺ لە ئیسلامیشدا ئەو کارەی پێ باش بووە و فەرموشیەتی ئەگەر ئێستەش بکرێ بەشدار دەبم, والله اعلم .

**٥٣٠** - وه شاهێدی دان بیدعەیە، و خۆ بەری كردن بیدعەیە، و وەلایەش بیدعەیە؛

جا شاهێدی دان ئەوەیە : كە كەسێك شاهێدی بەهەشت یان ئاگر لەسەر كەسێك بدات كە دەمرێ لە كاتێكدا هیچ هەواڵێك لەو بارەیەوە نەهاتووە - واتە لە هیچ فەرموودەیەك نەهاتووە ئەم كەسە دەچێتە كام بەهەشت یان دۆزەخ - .

وه ویلایە ئەوەیە : كە دۆستایەتی و سەرخستنی بۆ كۆمەڵێك هەبێ، و لە هەندێكی تر خۆی بەری بكا - لە كاتێكدا هەردوو كۆمەڵەكە موسڵمانیش بن - .

وه خۆ بەری كردن ئەوەیە : كە خۆی بەری بكا لە كۆمەڵێك كە لەسەر ئیسلام و سوننەتیشن .

## وه لە بیدعەكان :

**٥٣١** - ئەوەیە كە دەسەڵاتدار پیاوێك دەستگیر بكات و لێی بدات، و ئەشكەنجەی بدات، وە پێی بڵێ :

ئەو كارەت كردوە؟ وات كردووە؟ هەتاكو لە هۆشی خۆی دەبا .

---

: واتە بە زۆر وا لە كەسێك بكا دان بەو تۆمەتە بنێت كە دراوەتە پاڵی .

## وه له بیدعه‌كان :

**٥٣٢** - به‌كارهێنانی التغبیر ه له مزگه‌وته‌كاندا .

---

: التغبیر ئامێرێكی مۆسیقایه .

**٥٣٣** - وه ئه‌وه‌ی ئافره‌تان سوار السروج بن .

---

: السروج كورتانی وڵاخ بووه تایبه‌ت بووه به پیاوان، كه سه‌له‌ف ڕقیان له‌وه بووه ئافره‌تان سواری كورتانی تایبه‌ت به پیاوان بن، وه بۆ پیاوانیش به هه‌مان شێوه ڕقیان لێبووه سواری كورتانی تایبه‌ت به ئافره‌تان ببن .

**٥٣٤** - وه ئه‌وه‌ی كه پیاوان سواری كورتانی پڵنگ ببن .

---

: **امام احمد** (**مسند** - **١٧٣٢٧**) ده‌ڵێ : له معاویة وه رضي الله عنه به پیاوانێكی له هاوه‌ڵانی پێغه‌مبه‌ری ﷺ فه‌رموو : ئایا ده‌زانن كه رسول الله ﷺ نه‌هی كردووه كه سواری پێستی پڵنگ ببن؟ وتیان : اللهم به‌ڵێ .

**٥٣٥** - وه به‌كارهێنانی په‌رداخی زێڕ و زیو؛ و پۆشینی ئاوریشم و الدیباج .

: الديباج جۆرێكه له قوماش كه به ئاوريشم ناوەوە و دەرەوەی داپۆشراوه .

## وە له بیدعەکان :

**٥٣٦** - بینا کردن لەسەر گۆڕەکان، و دانیشتن لەسەریان .

**٥٣٧** - وە گەشتکردن بۆیان و زیارەتکردنیان .

## وە له بیدعەکان :

**٥٣٨** - بە گەورە ڕاگرتنی مردن - واته مردووەکه، والله اعلم - ، و دڕاندنی جل له کاتی هاتنیدا - واته کاتێك که مرد - ، و ڕەشکردنی دەرگاکان، وە بڕینی پەرچەمی قژ، وە دانیشتن له بەر دەرگای ماڵی مردووەکه دوای ناشتنی، وە پێدانی خواردنی ماڵی مردووەکه بۆ ئەو کەسانەی دێنه سەردانیان، وە مانەوەی شەوانی خەڵکی له ماڵی مردووەکه .

له جرير بن عبدالله البجلي وه رضي الله عنه دەفەرموێ : ئێمه کۆبوونەوەمان له ماڵی مردووەکه، و دروستکردنی خواردن له دوای ناشتنی به شیوەن و ڕۆڕۆ هەژمارمان دەکرد (**رواه احمد - ٦٩٠٥**) .

ئەم وتەیەش تەعزێکانی ئەمڕۆ دەگرێتەوە .

## وە لە بیدعەکان :

**٥٣٩** - خوێندنەوەی قورئان، و بانگ دان بە ئاواز، وە چواندنیان بە گۆرانی .

---

: **ابن القیم** لە (**الحوادث و البدع - ص ٨٥**) دەڵێ : ئەمما هاوەڵانی لەحن و ئاواز لە سەدەی چوارەمدا پەیدا بوون، جا لە لای زانایان هەجر کرابوون، چونکە خوێندنەوەی قورئانیان نەقڵ کردبووە سەر چەند شێوەیەکی ئاواز و گۆرانی، ئینجا ئەوەی بە کورتی دەخوێنرایەوە ئەوان درێژیان دەکردەوە، و ئەوەی بە درێژی دەخوێنرایەوە ئەوان کورتیان دەکردەوە، وە ئەوەی سکونی لەسەر بوایە حەرەکەیان دەخستە سەری، و ئەوەی حەرەکەی لەسەر بوایە ساکنیان دەکرد، وە پیتیان زیاد و کەم دەکرد، وە متحرکیان بە مجزوم دەخوێندەوە و مەجزومیش بە متحرك، بۆ ئەوەی لەگەڵ ئاوازەکانی خۆیان بیگونجێنن، و دواتریش ناویان بۆ دەدۆزینەوە .

## وە لە بیدعەکان :

**٥٤٠** - جوانکردنی موصحەفەکان .

**٥٤١** - وە ڕازاندنەوەی مزگەوتەکان .

**٥٤٢** - وە بەرزکردنەوەی مینبەرەکان .

## وە لە بیدعەکان :

**٥٤٣** - وەرگرتنی کرێ لە بەرامبەر : بانگ دان، و پێش نوێژی، و فێرکردنی قورئان، وە شوشتنی مردوو .

## وە لە سوننەت و تەواو بوون و کەماڵی ئیمان :

**٥٤٤** - خۆ بەریکردنە لە هەر ناوێك کە جیاواز بوو لە سوننەت، و دەرچوو لە کۆدەنگی ئوممەت، وە جودا بوون لە ئەهلەکەی، و دوورکەوتنەوە لەوەی کە ئەو بیروباوەڕەی هەبوو، وە نزیك بوونەوە لە الله عز و جل بە سەرپێچی کردنی، وە نمونەی ئەم وتانە :

رافضە، و شیعە، و جەهمی، و مورجیئە، حەروری، و موعتەزیلە، و زەیدیە، و ئیمامیە، و موغیریە، و ئیباضی، کەیسانی، و صفریە، و شراة، و قەدەری، مەنانی، و ئەزاریقە، و حلولی، مەنصوری، واقفی، و ئەوەی کە سیفاتەکانی بینین ڕەت دەکاتەوە .

وە لە هەموو وتەیەکی بیدعی، و ڕایەکی داهێنراو، و ئارەزوویەکی شوێنکەوتووش .

چونکە هەموو ئەمانە و هاوشێوەکانیان، و ئەوەی کە لەمانەوە لقی گرتووە، یان لێیانەوە نزیکە، چەند وتەیەکی نزم و هیچن، و چەند مەزهەبێکی خراپن، ئەهلەکەی لە دین دەکەنە دەرەوە، لەوانەی کە بڕوایان پێیەتی لە کۆمەڵی موسڵمانان .

**٥٤٥** - وە بۆ ئەم وتە و مەزهەبانە سەرانێك لە پێشەوایانی گومڕا، و کەسانێکی پێشەنگ لە کوفر و قسەی خراپدا، قسانێك دەکەن دەربارەی الله کە نایزانن، وە بەوەی کە هێناویانە ئەهلی حەق عەیبدار دەکەن، و تۆمەتیش دەدەنە پاڵ متمانە پێکراوانی نەقڵ، کەچی تۆمەت نادەنە پاڵ بۆچوونەکانی خۆیان .

ئەمانە عەقدیان لەگەڵ ئاڵای بیدعەدا بەستووە، و بازاڕی فیتنە، و دەرگای بەڵایان کردۆتەوە .

بوهتان بۆ الله هەڵدەبەستن، و قسە لەسەر کتێبەکەی هەڵدەبەستن بە درۆ و دوژمنایەتی .

ئەوانە برای شەیتانەکانن، و دوژمنی ئیمانداران، و ئەشکەوتی ستەمکارانن، و لانەی حەسودەکانن، ئەوان چەند گەل و هۆزێکن، وە چەند کۆمەڵە و تاقمێکن .

من لقێك لە ناوەکانیان، شتێك لە سیفاتەکانیان باس دەکەم؛ چونکە ئەوان کتێبیان هەیە کە بڵاو بوەتەوە، و وتەیان هەیە کە دەرکەوتووە، کەسی تازە بۆ ئەو قسانە لە خەڵکی نازانێ چییە، وە ئەوانەش کە تازە پێی دەگەن، واتای قسەکانیان دەشاردرێتەوە لە زۆرێك لەوانەی کە دەیخوێننەوە؛ جا لەوانەیە کەسی تازە - واتە بێ عیلم - کتێب ببات بۆ پیاوێك لە ئەهلی ئەم وتانە؛ جا دەست بە کتێب دەکا بە سوپاس کردنی الله، و ستایش کردنی، وە زۆر سەڵاواتدانیش لە پێغەمبەر ﷺ، پاشان دەست دەکات بە دەقیقی کوفرەکانی، و شەڕ و داهێنانەکەی دەشارێتەوە، جا ئەو کەسەی کە تازەیە و عیلمی لانییە، و ئەعجەمی - واتە غەیرە عەرەب - ، و بێ تەجروبەیە لە خەڵکی وا گومان دەبا :

ئەو کەسەی کە کتێبەکەی داناوە هەڵدەبەستێ زانایەکە لە زاناکان، یان فەقیهێکە لە فەقیهەکان، کەچی لەوانەیە ئەو کەسە لەم ئوممەتەدا بیروباوەڕی کەسانێکی هەبێ کە بت پەرستان، و ئەو کەسانە بۆی دەچن کە شەڕیان دژی الله ڕاگەیاندووە، و دۆستیایەتی شەیتانیان کردووە .

**٥٤٦** - جا سەرانیان کە پێشەنگن لە گومڕاییدا؛ وەکو :

الجهم بن صفوان ی گومڕای گومڕاکەر .

**٥٤٧** - وه كاتێك كه له شام بوو پێی وترا : دەتەوێ بۆ كوێ بچی ؟

وتی : به دوای پەروەردگارێك دەگەڕێم بیپەرستم .

جا چەند تاقمێك له گومڕاكان هەمان وتەی ئەویان وتەوە .

**٥٤٨** - وه ابن شۆذب وتی : جهم چل ڕۆژ وازی له نوێژ هێنا لەبەر گومان .

**٥٤٩** - وه له شوێنكەوتوانی و لایەنگرانی :

بشر المريسي، و المردار، و ابو بكر الأصم، و ابراهيم بن اسماعيل ابن علية، ابن ابي دؤاد، و برغوث، و ربالويه، و الأرمني، و جعفر الحذاء، و ابو شعيب الحجام، و حسن العطار، و سهل الخزار، و ابو لقمان الكافر، وه كۆمەڵێكی دیكه جگه لەمان .

وه هەموو زانایان دەربارەی ئەمانەی كه ناومان هێنان دەڵێن :

ئەوان پێشەوایانی كوفر، و سەرانی گومڕایین .

**٥٥٠** - وه له سەرانیان كه هاوەڵانی قەدەرن :

معبد الجهني، و غيلان القدري، و ثمامة بن الأشرس، و عمرو بن عبيد، و ابو الهذيل العلاف، و ابراهيم النظام، و بشر بن المعتمر .

وه كۆمەڵێكی دیكه جگه لەمان له ئەهلی كوفر و گومڕاییدا عامن .

لەوانه : محمد بن عبدالوهاب الجبائي، و ابو العنبس الصيمري .

**٥٥١** - وه له رافضة :

المغيرة بن سعيد، و عبدالله بن سبأ، و هشام الفوطي، و ابو الكروس، و فضيل الرقاشي، و ابو مالك الحضرمي، و صالح قبة .

بەڵكو ئەوان لەوە زیاترن کە بژمێردرێن لە کتێبێك، یان باس بکرێن بە وتارێك .

**٥٥٢** - باسی تاقمێکم لە پێشەواکانیان کرد؛ تا کەسی تازە، و بێ عیلمن خۆی دوور بگرێ لە :

باس و خواسیان، و دانیشتن لەگەڵ ئەو کەسەی شاهێدی بە وتەکانیان دەدا - واتە شاهێدی دەدا کە قسەکانیان ڕاستە - , وە مونازەڕە و مشتومڕ بە کتێبەکانیان دەکا .

**٥٥٣** - وە لە پیسەکانیان، کە لە وتەکانیاندا بەرگری، و سەرخستن بۆ سوننەت نیشان دەدەن، کەچی قسەکانیشیان پیسترین قسەن :

ابن کلاب، حسین النجار، و ابو بکر الأصم، و ابن علیة .

---

: ئەشعەریە جەهمیەکان لە تەحریفکردنی ئایەت و فەرموودەکانی سیفات شوێنی بشر المریسي کەوتوون کە لە ئەثەری **٥٤٩** باسکراوە، وە لە بابەتی ئیماندا خودی أبو حسن الأشعري شوێنی جهم بن صفوان کەتووە، وەک چۆن *إبن تیمیة* لە (**مجموع فتاوی** - ١٢٠/٧) ئەڵێت : وە ابو الحسن الأشعري قسەکەی جەهمی سەرخست لە بابەتی ئیمان دا، وە قسەکەی جەهم وتەیەکە هیچ کەس لە پێشەوایانی ئەهلی سوننە نەیان وتووە، بەڵکو احمد بن حنبل و وکیع و جگە لەوانیش تەکفیری ئەو کەسەیان کردووە کە قسەکەی جەهمی کردووە کە ابو الحسن یش ئەوەی سەر خستووە، وە لای ئەوان ئەم وتەیە خراپترە لە وتەی مورجیئەکان.

وه ئەشعەریە جەهمیەکان شوێنی کوللابیە لفظیە جەهمیەکان کەوتوون لە کوفری کەلامی نەفسیدا، هەر بۆیە کوفری ئەشعەریەت تێکەڵەیەکە لە کوفرەکانی جهم بن صفوان و بشر المريسي و إبن كلاب .

دەتوانن سوود لەو کەناڵە ببینن بۆ زیاتر ئاشنا بوون بە کوفری ئەشعەریە جەهمیەکان : https://t.me/imamakany_kufr

وە دەتوانن سوود لەم نووسراوە ببینن : https://t.me/Ktebxanay_salaf1/66

جا الله من و تۆ پەنا بدا لە وتەکانیان، و من و تۆ بپارێزێ لە شەڕ و مەزهەبەکانیان، وە من و تۆ لەسەر ئیسلام و سوننەت بژیێنێ، و لەسەری بمان مرێنێ، و حەشرمان کا لەسەری، وە ئەو نیعمەتە، و باشترین منەتەی بە من و تۆی داوە بۆمان نەگۆڕێ، وە دەست بەردارمان نەبێ لە پاداشتە چاکەکانی، و سوودە جوانەکانی، وە من و تۆ بکاتە پارێزکاران بۆ سنورەکانی، و بمانکاتە ئەوانەی بە مافەکانی هەڵدەستن، وە سود بە من و تۆ بگەیەنێ بەوەی کە فێرمانی کردووە، و بەکارمان بێنێ بۆ کردنی کاری چاك و وەرگیراو و ڕەزامەندکەر، وە من و تۆ حەشر بکا لەگەڵ کۆمەڵەی پێغەمبەرەکەی محمد ﷺ و هاوەڵانی رضي الله عنهم، چونکە هەر ئەوەیە کە هیوای بۆ دەخوازرێ، وە هاوڕێیە لە خۆشی و ناخۆشی، جا سوپاس بۆ الله لە سەرەتا و کۆتاییەوە، و صلى الله على نبيه محمد باطنا و ظاهرا .

و صلى الله على نبينا محمد و على آله و صحبه اجمعين.

